


حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان



# ئابووری

## بۆ پۆلی
## دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی و بازرگانی







حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# ئابووری

## بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی و بازرگانی

دانـانی
د.محمد سلمان محمد    د. مصطفی احمد حبیب
علی عمر عبدالرحمن

پێداچوونەوەی زانستی
د.جودت جعفرخطاب    د.محمد شعبان حسن
عمر علی شریف

چاپی هەشتەم    ٢٠١٥ زایینی    ٢٧١٥ کوردی    ١٤٣٦ کۆچی

# بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

**پێشەکی**

ئەم کتێبە دوابەدوای کتێبەکانی ئابووری پۆلی دەیەم و یازدەهەم دێت بۆ تەواوکردنی ئەو بابەتە زانستیانەی تیایاندا هاتووە، تاوەکو بگونجێ لەگەڵ ئەو زانیارییە کەڵەکە بووەی لای فێرخواز هەیە لەبارەی بابەتەکانی ئابووری، ئاسۆیەکی گەش و رووناک لەبەردەم فێرخواز بکاتەوە، بەتەواوی لە چەمکە زانستی و نوێیەکانی ئابووری تێبگات. ئەم کارەش لەسەر راسپاردەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان — ئێراق، بەرێوەبەرایەتی پرۆگرامەکان دانراوە.

ئەم پەرتووکە لە لایەن لیژنەیەکی پسپۆر لە مامۆستاو شارەزایانی زانکۆکانی هەرێمی کوردستان وەزارەتی پەروەردە دانراوەو هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆریان تێدا بینیوە بۆ ئەوەی ببێتە بابەتێکی پوخت و شیاو بۆ فێرخوازانی خۆشەویست و پانتایی بیریان فراوانتر بکاو زیاتر لە چەمکە ئابوورییەکان تێبگەن، بابەتەکانی ئەم پەرتووکە جۆرە بەیەکەوە تەواوکەری قۆناغەکانی دیکەی خوێندن و ئەمەش بۆ ئەوەی بۆ فێرخواز سوودمەندە، چونکە دەبێتە هۆی ئامادەسازییەك بۆ تێگەیشتن لە بنەما زانستییەکان و بانگراوندێکی فراوانیشە بۆ قۆناغەکانی زانکۆ تا کەڵکی لێوەربگرێ.

ئەم هەوڵەش سەرباریکی زانستییە کە لەلایەن پسپۆر و رۆشنبیرانی کورد دەدرێ بۆ بەهێزکردن و دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەکانی هەرێم بە بابەتی زانستی کە بگونجێت لەگەڵ پێشکەوتنەکانی جیهان. هیواداریین توانیبێتمان سەرکەوتووبین لە گەیاندنی ئەم پەیامە مەزنەو بەدەستهێنانی ئامانجەکەمان لە دانانی ئەم پەرتووکەدا.

زۆر سوپاسی ئەو کەسانەش دەکەین کە بە پێشنیارو رەخنەی بونیادنەر بەشداری دەکەن لە کەمتر کردنەوەی هەڵەکان و پوختکردنی ئەم پەرتووکە..خوا پشتیوانە..

دانەران

# بەشی یەکەم

# داهاتی نەتەوەیی و بارگۆڕانی ئابووری

NATIONAL INCOME & ECONOMIC FLUCTUATION

**پێشەکی:**

لێکۆڵینەوەی داهاتی نەتەوەیی لە هەر کۆمەڵگەیەکدا بێت بە گرنگترین ئەو نیشانانە دادەنرێت کە وێنەیەکی ژمارەیی دەدات بە چالاکییە ئابوورییەکان، چونکە هەموو پەیکەربەندیی تەوژمە سەوداگەرییەکان دەخاتەڕوو کە لە نێوان یەکە ئابوورییەکاندا ئەنجامدەدرێن لەڕووی بڕیارەکانی بەرهەمهێنان و وەبەرهێنان و بەکاربردن و بەکارهێنان و پاشەکەوتەوە لە کۆمەڵگەکەدا، هەروەها داهاتی نەتەوەیی هەر وڵاتێك ئاستی ئابووری ئەو وڵاتە دەنوێنێت و ڕادەی پێشکەوتن و گەشەسەندنی دەردەخات بە بەراوردکردن لەگەڵ وڵاتەکانی تردا.

**چەمکی داهاتی نەتەوەیی:**

دەتوانین داهاتی نەتەوە لە ڕێگای سێ چەمکەوە پێناسە بکەین:

١- داهاتی نەتەوەیی بەپێی پاداشتەکانی خاوەن بنەماکانی بەرهەمهێنان:

بریتییە لە سەرجەمی ئەو بەها نەختینەییانەی پاداشتەکانی خاوەن بنەماکانی بەرهەمهێنان لە بەرامبەر بەشداریکردنیان لەبەرهەمهێنانی شمەك و کارگوزارییەکاندا لە ماوەیەکی دیاریکراودا کە بەزۆری ساڵێکە.

- ئەم پاداشتانەش ئەم شێوانەی خوارەوە وەردەگرێت:

أ- کرێ (Wages) و مووچە (Salaries) داهاتی کار دەنوێنێت.

ب- موڵکانە (Rent) داهاتی خانووبەرە و زەوی دەنوێنێت.

ج- سوو (Interest) داهاتی خاوەن سەرمایەکان دەنوێنێت.

د- قازانج (Profit) داهاتی ڕێکخەرەکان دەنوێنێت.

| کەوتە (کرێ + مولکانە+ سوو + قازانج = داهاتی نەتە نەتەرەیی) |
|---|

۲- داهاتی نەتەوەیی بەپێی بەهای شمەك و کارگوزارییە تەواوەکان:

بریتییە لە سەرجەمی ئەو بەها نەختینەییانەی هەموو شمەك و کارگوزارییە تەولوەکان کە لە سەرجەم کەرتەکانی بەرهەمهێنانی ئابووری نەتەوەیی بەرهەمهێنراون لە ماوەی ساڵێکی دیاریکراودا.

بەرهەمی نەتەوەییش لە: کۆمەڵی جۆرلوجۆر لە شمەك و کارگوزاری وەك ئۆتۆمبیل و ئامێر و مەکینەو قوماش و تەختە و کانزا و گۆشت و سەوزە و کارگوزاری جیاواز...هتد پێکدێت، بۆیە کارێکی گرانە بتوانرێت ئەو برە زۆر و ناچۆنییەکانە کۆبکرێنەوە بەمەبەستی پێوانەکردنی قەبارەی بەرهەمی نەتەوەیی، لەبەر ئەوە پارە بەکارهێنرا وەك یەکەیەکی پێوانەکردن تا بەهای ئەو شمەك و کارگوزارییانە دیاری بکات کە بەرهەمی نەتەوەیی پێك دەهێنن.

۳- داهاتی نەتەوەیی لە ڕووی خەرجکردنەوە (Expenditure):

سەرجەمی ئەو برە پارانەیە کە کەسەکان و یەکە ئابوورییە جۆرلوجۆرەکان (میریی و کەرتی تایبەت) لە ماوەی ساڵێکدا بۆ کڕینی شمەك و کارگوزارییەکان خەرجی دەکەن.

**داهاتی تاکەکەس:** (Personal income)

ئەو پاداشتە نەختینەیی یان زیندەماڵییانەیە (یان هەردووکیان پێکەوە) کە تاکەکەس لە بەرامبەر بەشداریکردنی بیریی و بازوویی لە چالاکی بەرهەمهێناندا دەستی دەکەوێت.

دەتوانرێت جیاوازی لەنێوان دووجۆر لەو داهاتانە بکرێت کە خاوەن بنەماکانی بەرهەمهێنان دەستیان دەکەوێت و ئەوانیش (داهاتی دانەشکاو داهاتی ڕەخساوە).

- **داهاتی دانەشکاو:**

ئەو پاداشتانەیە کە خاوەن بنەماکانی بەرهەمهێنان دەستیان دەکەوێت پێش ئەوەی هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی داشکاندنی بەسەردا هاتبێت.

- **داهاتی ڕەخساو:**

ئەو داهاتەیە کە ئامادەی هەڵسوڕانە و هەمان داهاتە دانەشکاوەکەیە، بەلام باجی ڕاستەوخۆی لێدەرکراوە و کەسەکان لە بوارە جۆر بە جۆرەکان خەرجی دەکەن.

**ئەو هۆکارانەی ئاستی داهاتی نەتەوەیی دیاری دەکەن:**

ئاستی داهاتی نەتەوە و ڕادەی پەرەسەندنی پشت دەبەستێت بەم هۆکارانەی خوارەوە:

**١. بڕ و جۆری دەرامەتە ئابوورییەکان:**

بڕ و جۆری دەرامەتە ئابوورییەکان (سروشتی و مرۆیی) بەگرنگترین هۆکار دادەنرێن لە دیاریکردنی ئاستی داهاتی نەتەوە و توانای پەرەسەندنی، چونکە ئەگەر لە وڵاتێکی دیاریکراودا زەوی کشتوکاڵی باش و ئاوی زۆر هەبێت، ئەوە مانای ئەوەیە کە توانای پەرەپێدانی ئابووری لەو وڵاتە ئاسانتر دەبێت لە چاو دەوڵەتێك کە زەوییەکانی لەبار نەبێت بۆ کشتوکاڵکردن.

٢. شارەزایی هونەریی:

شارەزایی هونەری و ڕادەی کەڵك وەرگرتن لە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا بووە بە دیارترین هۆکار لە دیاریکردنی داهاتی نەتەوە و خێرا پەرەسەندنی، چونکە ئەو لێکۆڵینەوانەی لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا ئەنجام درلون ئەوەیان دووپات کردۆتەوە کە وەبەرهێنان لە سەرمایەی مرۆییدا هۆکارێکە بۆ زیادکردنی بەرهەمهێنان و پەرەپێدانی ئابووری.

هەر بۆیە نزمی ئاستی شارەزایی هونەریی لەو گرفتە سەرەکییانەیە کە ڕووبەڕووی دەوڵەتە دواکەوتووەکان دەبێتەوە لەکاتی هەوڵدانیان بۆ زیادکردنی بەرهەم و بەرهەمداریی و بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی گەلەکانیان.

٣. سەقامگیری ڕامیاری:

ئەزموونی زۆربەی دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان ئەوەیان سەلماندووە کە سەقامگیرنەبوونی باری ڕامیاری یەکێکە لەو هۆکارە گرنگانەیە کە دەبێتە کۆسپ لەبەردەم پەرەسەندنی ئابووریان، چونکە سەقامگیر نەبوونی ڕامیاری دەبێتە هۆی شلەژانی چالاکییە ئابوورییەکان و بێ هێزی و لاوازی هاندەر بۆ وەبەرهێنان، بەتایبەتیش لەکەرتی تایبەتی کە دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی بەرهەمهێنان و گەشەکردنی ئابووری.

٤- ڕامیاری ئابووری:

میری لە ڕێگەی ڕامیارییە ئابوورییەکانی(دارایی – نەختینەیی – بازرگانی) ڕۆڵێکی گرنگ لە زیادکردنی داهاتی نەتەوەیی و هاندان و ئاراستەکردنی وەبەرهێنان بۆ کەرتە جیاوازەکانی ئابووری دەبینێت کە لەگەڵ هێنانەدی ئاواتەکانی کۆمەڵگە و خۆشگوزەرانییاندا بگونجێت.

### ٥- ئاستی خستنەگەڕی بنەماکانی بەرهەمهێنان:

بەرهەمی نەتەوەیی کۆمەڵگە ناگاتە ئەوپەڕی قەبارەی بەرهەمهێنانی خۆی، ئەگەر ئاستی خستنەگەڕی هۆیەکانی بەرهەمهێنان کەمتر بێت، لە ئاستی خستنەگەڕی تەواوەتی خۆی، ئەمەش مانای بەفیڕۆدان و فەوتاندنی دەرامەتە ئابوورییە ڕەخساوەکانە، کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی لە دەستدانی دەرفەتی پێشکەوتن و پەرەسەندنی ئابووری.

### بەرهەمی نەتەوەیی: (National Product)

سەرەتادا پێویستە بیرمان بێتەوە (بەرهەمهێنان Production) بریتییە لە دروستکردنی سوود یان زیادکردنیەتی و لەو چالاکییانەدا دەردەکەوێت کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات بە ئامانجی پڕکردنەوەی پێداویستییە روو لە زیادبووەکانی خۆی. بۆیە **(هەرکارێك ببێتە هۆی دروستکردنی سوودێك و پێداویستییە مرۆییەکان پڕ بکەنەوە بەکاری بەرهەمهێن دادەنرێت هەرچەندە ئەگەر شێوەیەکی مادیشی نەبێت**، بۆ نموونە پزیشك و ئەندازیار و مامۆستا و پارێزەر....هتد) بە بەرهەمهێن دادەنرێن، چونکە سوودێك دەبەخشن و پێویستییەکی مرۆیی پڕ دەکەنەوە.

بەرهەمهێنانی شمەك و کارگوزارییەکان ئامانجێکی سەرەکییە کە مرۆڤ هەوڵ دەدات گەشەی پێبدات، چونکە پەرەسەندنی ئەم چالاکییە(بەرهەمهێنانە)یان دواکەوتنی ڕادەی پەرەسەندنی ئابووری نەتەوەیی دواکەوتنی دەستنیشان دەکات، هەروەها بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەمی نەتەوە و نزمبوونەوەی، بە ڕادەی گەشەکردن و پێشکەوتنی کەرتەکانی بەرهەمهێنانەوە بەسترلوە.

بەڵام (بەرهەمی نەتەوەیی) زاراوەیەکە (بە قەبارەی لێشاوی ئەو شمەك و کارگوزار ییە تەواوانە دەوترێت کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا کە بە زۆری ساڵێکە بەرهەمهێنراون و پێشی دەوترێت (تەوژمی شمەك)).

تێبینی ئەوەش دەکرێت کە بەرهەمی نەتەوەیی تەنها شمەك و کارگوزاری تەواو دەگرێتەوە(تەواو دروست کراو) کە ئاراستەی پڕکردنەوەی پێداویستیەکان کراوە، واتە شمەکە ناوەندییەکان و شمەکە نیمچە دروستکراوەکان ناگرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی دووریکەوینەوە لەو هەڵەیەی پێی دەوترێت دووجار حسابکردن، چونکە هەموو شمەکێك لە کاتی چالاکی بەرهەمهێنانیدا بە چەند قۆناغێکی جۆراو جۆردا تێدەپەڕێ لە سەرەتادا لە شێوەی یەکەمیدا کەرەستەی خاوە و دەگۆڕێت بۆ شمەکی ناوەندیی هەتا دەبێتە شمەکێکی تەواو دروستکراو، بۆ نموونە نان شمەکێکی تەواودروست کراوە و ئامادەیە بۆ بەکاربردن ، بەرهەمهێنانی نانەکە بەچەند قۆناغێکدا دەڕوات، لەسەرەتاوە گەنم وەك کەرەستەیەکی خاو و ئارد وەك کەرەستەیەکی ناوەندی لە بەرهەمهێنانی نانەکەدان و بۆ ئەوەی بەهای شمەکەکە لە جارێك زیاتر حساب نەکرێت، ئەوا بەرهەمی نەتەوەیی تەنها شمەکی تەواو دەگرێتەوە کە لە نموونەکەماندا نانەکەیە و لەپاشاندا ئەوانەی بەکارهێنراون لە بەرهەمهێنانی شمەکەکەدا دەچنە چوارچێوەی بەهای شمەکە تەواوەکە.

تێبینی: خزمەتگوزارییەکانی خوێندن و بەرگری و تەندروستی بە خزمەتگوزاری نیمچە دروستکراو دادەنرێن، چونکە پێویستییەکن لە پێداویستییەکانی چالاکی بەرهەمهێنان.

تەوژمی بەخولی داهات و خەرجکردن:

لە شیکردنەوەی چەمکی بەرهەمی نەتەوەییەوە بۆ دەرکەوت کە بەرهەمی نەتەوە بریتییە لە لێشاوێك لە شمەك و کارگوزارییە تەولو بەرهەمهێنرلوەکان لەسەرجەم کەرتە ئابوورییەکاندا لە ماوەیەکی دیاریکرلودا کە ساڵێکە و پێی دەگوترێ (**تەوژمی شمەك**).

لە بەرامبەریدا لێشاوێکی تر هەیە کە داهاتە دابەشکراوەکان (پاداشتەکان) دەنوێنێت کە خاوەن بنەماکانی بەرهەمهێنان لە بەرامبەر چالاکی بەرهەمێنانیاندا وەریدەگرن و پێی دەوترێت (**تەوژمی نەختینەیی**). لامان گرنگە لەم برگەیەدا شارەزای جوولەی بە خولی داهاتەکان ببین بەوەی کە پێدانی داهاتە لە کەرتی کارەوە (بەرهەمهێنان) بۆ کەرتی کەسەکان (بەکاربردن)، و خەرجیەکیشە بۆ کڕینی شمەك و کارگوزارییە بەرهەمهێنراوەکان لە کەرتی کەسەکانەوە بۆ کەرتی کار، ئەم لێشاوە نەختینەییە بەشێوەیەکی بازنەیی بەردەوام سووڕ دەخوات لە نێوان کەرتی کار کە داهات دروست دەکات بەوەی کە پاداشتی بنەماکانی بەرهەمهێنانە و لە نێوان کەرتی کەسەکان کە هەڵدەستن بە خەرجکردنی ئەو داهاتە بۆ کڕینی شمەك و کارگوزارییەکان کە کەرتی کار بەرهەمی هێناون.




وێنەی ژمارە (١) لێشاوی بەخولی **داهات و** خەرجکردن

**لەشێوەی ژمارە (١) ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە کەرتی کەسەکان دوو ڕۆڵ (ئەرك) دەبینن لە چالاکی بەرهەمهێناندا:**

**أ- بەشداری دەکەن لە چالاکی بەرهەمهێناندا، چونکە خۆیان خاوەنی بنەماکانی بەرهەمهێنانن.**

ب- هەڵدەستن بەکڕین و بەکاربردنی شمەك و کارگوزارییە بەرهەمهێنراوەکان.

**هەروەها کەرتی بەرهەمهێنانیش (کەرتی کار) دوو ڕۆڵ (ئەرك) دەبینن لە چالاکی بەرهەمهێنانەدا:**

**أ- بەرهەمهێنانی شمەك و کارگوزارییەکان و فرۆشتنیان.**

**ب- خستنەگەڕی بنەماکانی بەرهەمهێنان.**

**داهاتی نەختینەیی و داهاتی ڕاستەقینە**

پێویستە جیاوازی لە نێوان دوو زاراوە بکەین کە بە بەردەوامی لە ناو شیکردنەوە ئابوورییەکاندا باس دەکرێن کە ئەوانیش(داهاتی نەختینەیی و داهاتی ڕاستەقینەیە).

- **داهاتی نەختینەیی** (Monetary income)

سەرجەمی ئەو پاداشتە نەختینەییانەیە کە خاوەن بنەماکانی بەرهەمهێنان بەهۆی بەشداری کردنیان لە بەرهەمهێنانی شمەك و کارگوزارییەکاندا دەستیان دەکەوێت.

- **داهاتی ڕاستەقینە** (Real Income): بریتییە لە سەرجەمی ئەو شمەك و کارگوزارییانەیە کە خاوەن بنەماکانی بەرهەمهێنان بە داهاتە نەختینەییەکانیان دەستیان دەکەوێت.

لەپێشەوە ئاماژەمان بەوەدا کەبەرهەمی نەتەوە لە کۆمەڵێك شمەك و کارگوزاری گەورەو جۆراوجۆر پێکدێت کە کۆکردنەوەو بژاردنیان قورس و گرانە بەهۆی زۆری پێوەر و کێشانەکانیان کە بەکاردەهێنرێت لە پێوانە کردنیاندا وەك (تەن و مەتر و دۆنم و سەعاتی کارو...هتد).

ڕاستیش نییە بوترێت کە داهاتی نەتەوەیی لەو کۆمەڵە زۆرانەی شمەك پێکدێت کەجۆرلوجۆرو جیاوازن، بۆیە پارە بەکارهێنرا وەك یەکەیەکی پێوانەکردن بۆ دیاریکردنی بەهای داهاتی نەتەوە لەڕووی بەرهەمهێنانەوە.

داهاتی نەتەوەیش گوزارشت لە بەهای نەختینەیی هەموو شمەك و کارگوزارییە تەواو بەرهەم هێنراوەکان ئەکات لەساڵێکی دیاری کراودا. بۆنموونە کە دەوترێت داهاتی نەتەوەیی لەعێراقدا بۆ ساڵی (٢٠٠٥)دەکاتە (٢٥٠٠٠٠ملیار دینار) ئەمە مانای ئەوەیە کەبڕی شمەك و کارگوزارییە بەرهەم

هێنراوەکان لەساڵی (٢٠٠٥) بەنرخی باو لەبازاڕەکاندا حساب کراوە لەو ساڵەدا، لەبەر ئەوەی بەهای پارەکە کراوە بەیەکەی پێوانەکردن جێگیر نییە، بەڵکو تووشی گۆڕان دەبێت بە(بەرزبوونەوەو نزمبوونەوە) لەگەڵ گۆڕانی ئاستی نرخی شمەك و کارگوزارییەکان و بەهای پارە (هێزی شت کڕین) بەرز دەبێتەوە لەگەڵ دابەزینی ئاستی گشتی نرخی شمەکەکان، هەروەها بەهای دادەبەزێت لەگەڵ بەرزبوونەوەی نرخی شمەکەکان، واتە پەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە لەنێوان بەهای پارەو ئاستی گشتی نرخی شمەك و کارگوزارییەکان، بۆیە پارە بە پێوەرێکی ورد دانانرێت بۆ گەیشتن بەبەهای ڕاستەقینەی داهاتی نەتەوەیی، ئەمەش بەهۆی گۆڕانی هێزی شت پێ کڕینەکەی لە ماوەیەکەوە بۆ ماوەیەکی دیکە.

بەمەبەستی خۆلادان لەگۆڕانی بەهای پارە ژمارەی پێوانەیی نرخەکان[1] بەکاردەهێنین بۆ گەیشتن بە بەهای ڕاستەقینەی داهاتی نەتەوەیی (داهاتی ڕاستەقینەی نەتەوەیی) و دوورخستنەوەی کاریگەریی گۆڕانی نرخەکان لەسەر داهاتی نەتەوەییەوە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەگرینە بەر:

١- دیاریکردنی ساڵێك لە ساڵەکان وەك (ساڵی بنەڕەت) کە ئەو ساڵە نرخ تاڕادەیەك تێیدا جێگیرەو نەگۆڕ بێت و لەپاشاندا نرخەکانی دەکرێت بەپێوەر، واتە نرخی ساڵەکانی دیکەی پێ دەپێورێت.

٢- بەکارهێنانی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە بۆ دۆزینەوەی داهاتی ڕاستەقینەی نەتەوەیی :

$$\text{داهاتی ڕاستەقینەی نەتەوەیی} = \frac{\text{داهاتی نەختینەی نەتەوەیی}}{\text{ژمارەی پێوانەکاری نرخەکان}} \times ١٠٠$$

---

١_ **ژمارەی پێوانەیی نرخەکان:** ساڵێکی دیاریکراو وەردەگیرێت و برەکانی ئەو ساڵە (ساڵی بنەڕەت) لێکدەدرێتەوە، هەروەها بەگۆڕەی نرخەکانی ئەو ساڵە دیاریکراوەش بری ئەو شمەك و کارگوزارییانەش کە لەساڵەکانی دیکە بەرهەم هاتوون حیساب دەکرێن.

### پێکهێنەرەکانی داهاتی نەتەوەیی:

بەگوێرەی ئەو پۆلێنکردنەی لەدەزگای ئاماری سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان کراوە، ئابووری نەتەوە لە سێ کەرتی سەرەکی پێکدێت و هەریەکەشیان لەچەند چالاکییەکی ئابووری پێکدێن و داهاتی نەتەوەش لەسەرجەمی بەرهەمی ئەم کەرتانە پێکدێت کەئەمانەن:

١- کەرتی شمەك ئامێن: پێکدێت لە:

أ- کشتوکاڵ و دارستان و ڕاوکردن.

ب- کانزاکاری و کانەبەرد: دەرهێنانی نەوتی خاو و کانزاکانی دیکەش دەگرێتەوە.

ج- پیشەسازییە گۆڕانکارییەکان: وەك پیشەسازییەکانی بەکاربردن و پیشەسازی شمەکی نیمچە دروستکراو.

د- کارەبا و گاز و ئاو.

هـ- دامەزراندن و بینا دروستکردن.

٢- کەرتی دابەشکردن: پێکدێت لە:

أ- گواستنەوەو هاتووچۆ و عەمبارکردن.

ب-بانکەکان و بیمەکردن و خانووبەرە.

ج- بازرگانی ناوخۆ و دەرەکی.

٣- کەرتی کارگوزاری: لە سەرجەمی کارگوزارییە کۆمەڵایەتی و گشتییەکان و کارگوزارییەکانی کەرتی تایبەت پێکدێت.

### ڕێگەکانی حسابکردنی داهاتی نەتەوەیی:

لەم برگەیەدا باس لەسەر ڕێگەو شێوازە بەکارهێنراوەکانی پێولەکردن و خەملاندنی داهاتی نەتەوەدا دەکەین کە بەکارهێنراون، بەپشت بەستن بەو دلتا ئامارگیرییانەی کە تایبەتە بەداهاتی نەتەوە و چۆنیەتی هەڵسوڕاندنیان و لەم حسابکردنە ئاستی چالاکی ئابووری بۆ هەموو کەرتەکان ڕوون دەبێتەوە و ڕادەی گەشەکردن و پەرەسەندنیان نیشان دەدرێت، هەروەها ئەم حسابکردنە قەبارەی بەرهەمهێنان، قەبارەی خەرجی بەکارهێنان و وەبەرهێنان و قەبارەی مامەڵە لەگەڵ دەرەوە (بازرگانی دەرەکی) پیشان دەدات، لەلایەکی تریشەوە حسابکردنی داهاتی نەتەوە بەشداری دەکات لە بەهێزکردنی ئامرازەکانی شیکردنەوەی ئابووریدا کە توێژەری ئابووری پشتی پێ دەبەستێت لەشیکردنەوە و لێکدانەوەی دیاردەو گرفتە ئابوورییەکان و چارەسەرکردنیان.

### ڕێگەی یەکەم: ڕێگەی بەهای زێدەدانراو یان بەرهەمی تەواوەتی: (Value Added approach)

پوختەی ئەم ڕێگەیە ئەوەیە کە هەموو شمەك و کارگوزارییە بەرهەم هێنراوەکان لەکەرتە ئابوورییە جۆرلوجۆرەکانی (شمەك ئامێز – دابەشکردن – کارگوزاری) کۆبکەینەوەو بەها نەختینەییەکانیان بەپێی نرخی بازاڕ حیساب دەکەین:

بەهای بەرهەمی هەمووەکی = شمەك و کارگوزاری بەرهەمهێنراو × نرخەکانیان

واتە (بڕەکەی × نرخەکەی)

و لەدواییدا بەهای پێویستییەکانی بەرهەمهێنان وەك کەرەستەی خاو و شمەکی نیمچە دروستکراو و وزە و..........هتد حساب دەکەین کە بەشدارییان کردووە لەچالاکی بەرهەمهێنانەکەدا و بەهای پێویستییەکانی بەرهەمهێنان لەبەهای بەرهەمی هەمووەکی دەردەکەین دەگەینە بەهای زێدەدانراوی هەر کەرتێك، بۆیە دەتوانین پێناسەی (بەهای زێدەدانراو) بکەین بەوەی: **(جیاوازییە لەنێوان بەهای بەرهەمی هەمووەکی بۆ یەکەیەکی بەهەمدارى و بەهای پێویستییەکانی بەرهەمهێنان کە بەکارهێنراوە لە چالاکی بەرهەمهێناندا لەماوەیەکی دیاری کراودا (ساڵێك))**

بەهای زێدەدانراو= بەهای بەرهەمی هەمووەکی- بەهای پێویستییەکانی بەرهەمهێنان

بەکۆکردنەوەی بەهای زێدەدانراوی هەموو کەرتە ئابوورییەکان (شمەك ئامێز – دابەشەکی – کارگوزاری) سەرجەمی داهاتی نەتەوەمان دەست دەکەوێت.

گەر وادابنێین لەکەرتی پیشەسازیدا پرۆژەیەکمان هەیەو قوماش بەرهەم دەهێنێت و بەهای بەرهەمی هەمووەکی ئەم پرۆژەیە (١٥٦٠٠ دۆلار) بێت و بەهای پێویستییەکانی بەرهەمهێنانیش لەم چالاکی بەرهەمهێنانەدا بەم شێوەیە بووە:

| بەهاكان بە دۆلار | داتاكان |
| --- | --- |
| ١٠٠٠٠ | كرینی لۆكە |
| ٢٥٠ | تێچوونی گواستنەوەی لۆكە بۆ كارگە |
| ٥٠ | تێچوونی گواستنەوەی لۆكە چنراوەكان بۆكارگەی بۆیاخكردن |
| ١٥٠ | بۆیاخكردن و نەخشكردنی قوماشەكان |
| ٥٠ | وزە |
| ١٠٥٠٠ | بەهای پێویستییەكانی بەرهەمهێنان |

**بەهای زێدە دانراو = بەهای بەرهەمی هەمووەكی − بەهای پێویستییەكانی بەرهەمهێنان**

**= ١٥٦٠٠ − ١٠٥٠٠**

**= ٥١٠٠ دۆلار**

**لەمەشەوە بە دۆزینەوەی بەهای زێدەدانراوی هەموو كەرتەكانی ئابووری كۆكردنەوەیان بەهای داهاتی نەتەوەمان دەست دەكەوێت.**

**ڕێگەی دووەم: ڕێگەی داهاتی دابەشكراو(** Income disturputed Approach**):**

**ئەم ڕێگەیە لە حسابكردنی داهاتی نەتەوەدا پشت بە كۆكردنەوەی ئەو داهاتانەی دەبەستێ كە بەسەر هەموو خاوەن بنەماكانی بەرهەمهێنان دابەشكراوە، واتە كۆكردنەوەی دەسهاتی بنەماكانی بەرهەمهێنانە و داهاتی نەتەوەش بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش دەكرێت:**

أ- كرێ و موچە و پاداشتەكان: دەدرێت بە كرێكارەكان و كارگێڕییەكان و هونەرییەكان و كەسانی دیكە.

ب- موڵكانە و كرێ خانوو: دەدرێت بە خاوەن زەوی و خانووبەرەكان.

ج- سوو: دەدرێت لە بەهای بەكارهێنانی سەرمایەدا.

د- قازانج: داهاتی ڕێكخەر دەنوێنێت كە بەشدارە لە چالاكی بەرهەمهێناندا.

بە كۆكردنەوەی ئەم داهاتە دابەشكراوانەی گشت كەرتە ئابوورییەكان كە بەسەر خاوەن بنەماكانی بەرهەمهێنان دەبەخشرێتەوە لە ماوەی ساڵێكدا بەهای نەختینەیی داهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتەمان دەست دەكەوێت.

رێگەی سێیەم: رێگەی خەرجكردن (Expenditure Approach):

ئەم رێگەیە بە یەكێك لە رێگە سەرەكییەكانی دیاریكردنی داهاتی نەتەوەیی یاخود بەرهەمی نەتەوەیی دادەنرێت لە كۆمەڵگەداو تێڕوانین بۆ داهاتی نەتەوەیی لە گۆشەی خەرجكردنی كۆتایی بۆ شمەك و كارگوزارییە تەواوەكانی بەكاربردن و وەبەرهێنان لە ماوەیەكی دیاری كراودا (ساڵێك) كە كە لەلایەن كەس و دەزگاكانی میرییەوە خەرج دەكرێن، ئەم رێگەیە پێشی دەوترێت رێگەی بەكارخستن یان خەرجكردنی داهاتی رەخساو كە خاوەن بنەماكانی بەرهەمهێنان دەستیان دەكەوێت.

ئەم رێگایە خەرجییەكان لەسەر بنەڕەتی دوا بەكارهێنانیان حساب دەكرێت و خەرجییە ناوخۆییەكان دابەش دەكرێتە سەر چوار بنەمای سەرەكی و خۆی لەمانەی خوارەوەدا دەبینێتەوە:

**أ- خەرجی بەکاربردن:** ئەمەش خەرجی کەرتی خێزان دەگرێتەوە بۆ شمەکە تەمەنــدارەکان (ئۆتۆمبێــل - تەلــەفزیۆن - جلشــۆر... هتــد) و شمــەکی بەکاربردن(خۆراك - جلوبەرگ .... هتد).

**ب- خــەرجی وەبــەرهێنانی نــاوخۆیی تایبــەتی:** ئەمــەش خــەرجی کــەرتی بەرهەمهێنان دەنوێنێت لەسەر شمەکی بەرهەمهێنانی وەك ئامێر - مەکینە.

**ج- خەرجی میری:** دوو جۆر خەرجکردن دەگرێتەوە:

١- ئەو خەرجیانەی میری کە لە بەرامبەریاندا شمەك یان کارگوزاری دەست دەکەوێت.

٢- ئەو خەرجیانەی میری کە لە بەرامبەریاندا هیچ شمــەك و کارگوزارییــەکی دەست ناکەوێت.

**د- پوختەی مامەڵە دەرەکییەکان:** ئەمەش پوختەی ئەو مامەڵە دەرەکییانە دەنوێنێت کە دەوڵەت ئەنجامی دەدات لەگــەڵ دەوڵەتــەکانی تــردا بەشێوەی (هاوردەو ناردەنی).

کەواتە: پوختەی مامەڵەی دەرەکی = نێراو - هێنراو

لێرەشەوە شارەزای ئەوە دەبین کە خەرجی نەتەوە(داهاتی نەتەوە) دەکاتــە سەرجەمی هەموو خەرجییەکانی هەر چوار کەرتەکانی (خەرجی بــەکاربردن+ خەرجی وەبەرهێنان + خەرجی میری + پوختەی مامەڵە دەرەکییەکان).

**ئاستەنگەکانی حسابکردنی بەرهەمی ناوەخۆ (داهاتی نەتەوە):**

لە کاتی خەمڵاندنی داهاتی نەتەوەدا شارەزایانی ئەم بوارە ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگ دەبنەوە کە خۆی لە جیاوازی دیاری کردنەکان دەبینێتەوە، وا لە خوارەوەش چەند ئاستەنگێك دەست نیشان دەکەین:

١- ڕێگاکانی ئامادەکردنی حسابی داهاتی نەتەوە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی تر بە پێی شێوازی ئامادەکردنی حسابەکان لەلایەك و بە پێی ڕادەی بوونی دلتا لەسەر مامەڵە ئابوورییەکان کە ئەنجام دەدرێت لە سەر چالاکییە ئابوورییەکانیان جیاوازە لە کاتی ئامادەکردنەکەدا لە لایەکی ترەوە.

٢- کەمی داتا ئامارگرییەکانی تایبەت بەداهاتی نەتەوە، چونکە هەندێك شمەك و کارگوزاری کە لە کۆمەڵگەدا بەرهەم دەهێنرێت ئەو داتا(زانیارییە) فەرمییانە نیشانیان نادات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە دیاریکردنی داهاتی نەتەوە کەمتر بێت لە ڕاستییەکەی.

٣- بەرهەمهێنانی هەندێك کارگوزاری لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵگەوە بەکاردەهێنرێت بۆ ئەوەی بچێتە بازاڕ و بەهایان دیاری بکرێت وەك ئەو کارگوزارییە کەسییانەی کە ئەندامانی کۆمەڵگەیەك پێشکەش بە یەکتری دەکەن، وەك ئەو خزمەتگوزاری و کارەی ژنەکان لەماڵەوە دەیکەن، یان کاتێ جوتیارەکان بەشێك لە بەرهەمە کشتوکاڵییەکانیان بەکاردێنن و ئەم کارگوزارییانە حیساب ناکرێن، ئەمەش دەبنە هۆی ئەوەی ڕاستی خەمڵاندنی داهاتی نەتەوە کەمتر بێت.

٤- گرانی جیاکردنەوە لە نێوان شمەك و کارگوزارییە ناوەندییەکان و شمەك و کارگوزارییە تەواوە دروست کراوەکان وەك کارگوزاری دادگا و بەرگری و ئاسایش کە هەموویان کارگوزاری تەواو دروست کراون و بەهاکانیان بە پێی ئەو خەرجیانە دیاری دەکرێت کە دەوڵەت ئەنجامی داوە، بەڵام هەندێك لە

ئابووریناسەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەمانە کارگوزاری ناوەندین و تەواو دروستکراو نین.

٥- هەندێك دەسهات هەیە کە خاوەنەکانیان وەری دەگرن بێ ئەوەی بەشداریان کردبێت لە بەرهەمهێناندا وەك بەخشینەکان و دیاریەکان و یارمەتییەکانی وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتی بۆ پیرو پەککەوتەکان لەبەر ئەوە پێویستە لە داهاتی نەتەوەدا حساب نەکرێت، چونکە لە ڕاستییەکەی زیاتر دەردەکەوێت.

## بارگۆڕانی ئابووری:

ژیانی ئابووری کۆمەڵگە نوێیە سەرمایەدارییەکان بەوە دەناسرێت کە تووشی بارگۆڕانی بەخول دەبێت لە بەرهەمهێنانی هەموەکیدا، بەڵام ئەم بارگۆڕانە بەخولانە لە بیردۆزی ئابووریدا بایەخپێدانیکی ڕێژەیی کەمیان بەرکەوتووە تا ئەم سەردەمە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بارگۆڕانە بە خولەکان لەکۆندا شوێنەواری کۆمەڵایەتی بەرفراوانی لێ نەکەوتەوە، بەڵام پاش جەنگی جیهانی یەکەم بێکاری بەردەوام (ماوەدرێژ) لە نێوان کرێکارەکاندا سەری هەڵدا.

لەو دەوڵەتانەی کە لەڕووی ئابوورییەوە پێشکەوتوون و ئەو بێکارییەی دوای جەنگی جیهانی یەکەم سەری هەڵدا بووە دیاردەیەکی جیهانی، جیهان لەسەرویەندی ماوەی نێوان ١٩٢٩ - ١٩٣٣ بێ بازارێەکی گەورەی بەخۆوە بینی کە بووە هۆی زۆربوونی ژمارەی بێکاران، هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە لە سروشت و هۆکارەکانی بارگۆڕانی ئابووری بکۆڵنەوە و بەشێکی گەورەی نووسینە ئابوورییەکانیان بۆ تەرخان بکەن لە ماوەی ئەم پەنجا ساڵەی دواییدا.

## پێناسەی بار گۆڕانی ئابووری:

مەبەست لە بارگۆڕانی ئابووری (ئەو قۆناغانەن کە چالاکی ئابووری گشتی بە بەرزبوونـەوە بێـت یـان نزمبوونـەوە پێدا تێپـەڕ دەبێـت بـە گـوێرەی ئـەو گۆڕانانەی لـە خواسـت و خسـتنەڕووی هەمووەکیـدا ڕوودەدات، چـوار قۆنـاغ هەیە بۆ بارگۆڕانی ئابووری کە ئەمانەن ﴿وەستاوی ، بێ بازاڕی ، بوژانـەوە، برەوسەندن﴾.

## قۆناغەکانی بارگۆڕانی ئابووری

### ١- قۆناغی وەستاوی (الرکود) Recession :

مەبەسـت لـە وەسـتاوی (کەمبوونـەوەی بەرهـەمی هـەمووەکی و داهـات و کارپێدان و ئاڵوگۆڕی دەرەکییە. بەزۆری شەش مانگ یان زیاتر دەخایـەنێت و ئەم تۆخە بە کەمبوونەوەی چالاکی ئابووری دەناسرێت) لە زۆربەی کەرت و چالاکی و بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکاندا.

### ٢- قۆناغی بێ بازاڕی (الکساد) ( Depression ):

ئەم قۆناغە چالاکی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی تیایدا دەگاتـە نـزمترین ئاسـت پاش ئەوەی قۆناغی وەستاوی کە بـەردەوام دەبێـت و بـەوە دەناسـرێت کـە تێکرایی بێکاری زیاد دەکات و بازرگانی تووشی بێ بازاڕی دەبێت و نرخەکان زۆر دادەبەزێت.

### ٣- قۆناغی بوژانەوە (الانتعاش): (Recovery)

پاش قۆناغی یەکەم و دووەم ئابووری نەتەوە دەست دەکات بە بوژانەوە بەهۆی ڕامیارییە ئابوورییە گونجاوەکانەوە کە ئابووری نەتەوە دەست دەکات بە بەرزبوونەوەیەکی پلە پلە(لەسەرخۆ) و لەگەڵیدا قازانجی هەمووەکی و کارپێدان و کرێ و نرخی سوو زیاد دەکەن.

### ٤ - قۆناغی برەوسەندن (الازدهار) (Boom):

ئەو قۆناغەیە کە بەرهەمهێنانی تێدا دەگاتە بەرزترین ئاست پاش قۆناغی بوژانەوە و بە بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان و کارپێدان و گەشەکردنی بازرگانی و بەرزبوونەوەی ئاستی داهات دەناسرێت یان قۆناغێکە کە هەموو هۆکارەکانی بەرهەمهێنان لە کار دەبن.

دەتوانرێت ئەم چوار قۆناغە بەم شێوەیەی لای خوارەوە وێنە بکرێت:




شێوەی ژمارە (٢) قۆناغەکانی بارگۆڕانی ئابووری

چەند نیشانیەکی سەرەکی بۆ دیاریکردنی ئەم قۆناغە ئابوورییانەدا بەکاردێن کە ئەمانەن:

أ- گۆڕان لە سەرجەم یان پوختەی بەرهەمی نەتەوە.

ب- گۆڕان لە تێکڕای بێکاری یان کارپێدان.

ج- گۆڕان لەئاستی گشتی نرخ بۆ سەرجەم شمەك و کارگوزارییەکان.

بەڵام لێکدانەوەی هۆکارەکانی بارگۆڕانی ئابووری دەتوانین لە دوو بۆچووندا کۆ بکەینەوە کە ئەمانەن :

- **بۆچوونی یەکەم ( ئاراستەی یەکەم):**

بارگۆڕانەکە وا لێك دەداتەوە کە بەهۆی کەمی خواستی هەمووەکی و بەتایبەتیش خواستی بەکاربردنەوە دروست دەبێت، بەمانایەکی تر خەرجکردن بۆ شمەکی بەکاربردن کەمترە لەقەوارەی بەرهەمهێنان بەهۆی خراپ دابەشکردنی داهات و سامانەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی زیادە لەبەرهەمهێنانی شمەك و لەبەرامبەریدا خواستێکی کەم هەیە دروست ببێت، ئەوەش وا دەکات بێ بازاری ڕوو لەو شمەکە بکات و ئاستی بەرهەمهێنان کەم بێتەوە، لەکۆتاییدا دەبێتە هۆی لەکارخستنی بەشێك لەیەکەکانی بەرهەمهێنان و بەرزبوونەوەی تێکڕای بێکاری و لەپاشاندا وەستاوی و بێ بازاڕی دروست دەکات. ئەم بۆچوونە پێی دەوترێت (کەمبوونەوەی بەکاربردن)، (under consumption)، چونکە توانای شت کڕین بەبەردەوامی کەمترە لە قەوارەی بەرهەمهێنان.

**بۆچوونی دووەم (ئاراستەی دووەم):**

بارگۆڕانی ئابووری بەهۆی فراوانبوونی وەبەرهێنانەوە دروست دەبێت، چونکە وەبەرهێنەکان گەشبینن یان دڵفراوان و بەئومێدن و دیاری کردنەکانیشیان(خەمڵاندنیان) ورد نەبووە. ئەم فراوانکردنە دەبێتە هۆی دروستبوونی گرفتێك لە هاوسەنگی نێوان پاشەکەوت و وەبەرهێنان، ئەمەش دەبێتە هۆی دامەزراندنی دامو دەزگای بەرهەمهێنانی زۆر و لەپاشاندا فراوانبوون لە بەرهەمهێنانی شمەك و کارگوزارییەکان بەڕاددەیەك گەورەتر بێت لەقەبارەی خواست لەسەریان، ئەمەش بەدەرکەوتنی وەستاوی و بێ بازاڕی کۆتایی دێت.

لەوەی پێشەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەبارگۆڕانی ئاستی چالاکییە ئابوورییەکان ئەو دۆخە ناهاوسەنگییە دەنوێنێت کە لە نێوان داهاتی نەتەوە و خەرجی نەتەوەدایە، کاتێك داهاتی نەتەوە یەکسان بێت بە خەرجی نەتەوە ئەوا ئابووری نەتەوە لە **دۆخی هاوسەنگی** دا دەبێت(خواستی هەموەکی یەکسان دەبێت بە خستنەڕووی هەموەکی )، بەڵام ئەگەر قەبارەی خەرجی نەتەوە کەمتر بێت لە قەبارەی داهاتی نەتەوە ئەوا ئابووری لە **دۆخی داکشانەوە** دەبێت، بەڵام ئەگەر قەبارەی خەرجی نەتەوە گەورەتر بێت لە قەبارەی داهاتی نەتەوە ئەوا ئابووری لە **دۆخی بەرفراوانبوون** دا دەبێت(هەڵاوسان).

کەواتە بارگۆڕانی ئابووری کە چالاکییە ئابوورییەکان ڕوویەڕووی دەبنەوە لە ڕاستیدا دەرچوونی چالاکییە ئابوورییەکانە لەو دۆخی هاوسەنگییەی کە هەیەتی و ڕووەکانی ئەم بارگۆڕانانەش داکشانەوە و هەڵاوسانە کە دێینە سەر شیکردنەوە و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان.

# هەڵاوسان

## INFLATION

پێشەکی:

هەڵاوسان بە یەکێك لە گیروگرفتە ئابوورییە سەرەکییەکان دادەنرێت کە لەم سەردەمەدا جیهان پێوەی دەناڵێت، سەرەڕای بایەخدانی ئابووریناسەکان بەم دیاردەیە هەتا ئێستا مشتومڕێکی زۆر هەیە دەربارەی هۆکارەکانی و کاریگەری ئابووریان لەسەر ڕژێمی ئابووری و باشترین ڕامیاری کە پێویستە پەیڕەو بکرێت تا زاڵ بین بەسەریدا یان چارەسەری بکرێت.

لەمڕۆدا هەڵاوسان شوێنێکی گەورەی دیاری کردووە لە لێکۆڵینەوەی زانستی ئابووریدا لەبەر چەند هۆیەك کە لە گرنگترینیان:

١. بیریی کلاسیکی (کۆن) هەمیشە هۆکارەکەی بە زۆربوونی بڕی دراو و بەرزبوونەوەی ئاستی گشتی نرخەکان دەبەستێتەوە، بێ ئەوەی ئاماژە بە هۆکارەکانی تر بکات.

٢- مەترسی لە کاریگەری هەڵاوسان لەسەر چالاکییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان.

٣- هەڵاوسان پاش جەنگی جیهانی دووەم بووە بە دیاردەیەکی بڵاو لە زۆربەی دەوڵەتە پێشکەوتوەکان و تازەپێگەیشتوەکان دا.

پێناسەی هەڵاوسان:

(هەڵاوسان ئەو بەرزبونەوە بەردەوام و هەست پێکراوەیە لە ئاستی گشتی نرخەکاندا ڕوودەدات لە دەوڵەتێکدا لەوە دروست بووە کە خواستێکی زیاتر هەیە لەچاو خستنە ڕووی شمەك و کارگوزارییەکاندا لە ماوەیەکی دیاری کراودا کە لەشمەش مانگ زیاترە).

یان ئەو زۆربوونی بڕی پارەیەیە کە بە ڕادەیەکە لەگەڵیدا بەهای پارە لە بازارەکاندا دادەبەزێت.

## جۆرەکانی هەڵاوسان:

۱- هەڵاوسانی خشۆك (هەڵاوسانی مام ناوەندی):

ئەو هەڵاوسانەیە کە نرخەکان بە تێکڕایەك زیاد دەکات ناگاتە ١٠٪ و زۆر لەسەرخۆ دەبێت لە زیادبوونەکانیدا.

۲- هەڵاوسانی سەرکێش:

ئەو هەڵاوسانەیە کە ئاستی گشتی نرخەکان بە تێکڕاییەکی زۆر بەرز زیاد دەکەن و تیایدا دەستاودەستکردنی دراو زۆر دەبێ و دراوەکان لە ئەرکی سەرەکی خۆیان دەوەستن کە کۆکەرەوەی بەهاکانن، ئەمەش دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی سیستەمی نەختینەیی و نەمانی بەهای یەکەی دراو، وەك ئەوەی لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٢١ ڕوویدا ئەم جۆرەش بەزۆری بەستراوەتەوە بە هەلومەرجی شەڕ و شۆڕش و جێگیر نەبوونی باری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی دەوڵەتەوە.

۳- هەڵاوسانی کپکراو:

بریتییە لە دانانی نرخ لەلایەن دەسەڵاتدارە بەرپرسەکانەوە و بارێکی کاتییە، چونکە یان ئەوەتا دەسەڵاتداران دەتوانن باری ئابووری ڕاست بکەنەوە بە کار ڕاپەڕاندنەکانیان لە ڕێگەی نرخی زۆرەملی و دابەشکردن بە کۆبۆن یان ئەوەتا بارەکە لە دەست دەردەچێت و هەڵاوسانەکە ڕوو لە زیاد بوون دەکات و زۆرجار ئاڵۆزتر دەبێت و دەگۆڕێت بۆ هەڵاوسانی سەرکێش.

٤- هەڵاوسانی بەخێرایی زیاد بوون:

بریتییە لە بەرزبوونەوەی نرخەکان بە تێکرایەك کە زۆرترە لە تێکرایی زیادبوونی هەڵاوسانی خشۆك، بەڵام ماوەی مانەوەکەی لە هەڵاوسانی خشۆك کەمترە.

## هۆیەکانی هەڵاوسان:

١- هەڵاوسانی خواست: (Demand inflation)

ئەم جۆرەی هەڵاوسان لە ئەنجامی ئەوەوە پەیدا دەبێت کە قەبارەی پارە لای کەسەکان زۆر زیاد دەکات و قەبارەی شمەك و کارگوزارییەکانی رەخساوی کۆمەڵگە جێگیر دەبێت (ناگۆڕێت)، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخەکان بە شێوەیەکی بەردەوام و ڕوو لە زیادبوون هەڵاوسانێك دەهێنێتە کایەوە کە پێی دەوترێت (هەڵاوسانی خواست). لەوانەیە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی ببێتە هۆی دەرکەوتنی ئەم جۆرە ئەوە بێت کە بە کورتهێنانی دارایی ناسراوە (ئەو دۆخەیە کە خەرجییەکانی گشتی زیاتر بێت لە دەسهاتی گشتی) و کاتێك میری چارەسەری ئەم کورتهێنانە دەکات لە ڕێگەی دەرکردنی دراوەوە لەلایەن بانکی مەرکەزییەوە ئەوا ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئابووری بە بڕێکی زۆری پارە تێر بکرێت (پارەدار بکرێت) کە لە بەرامبەریدا فرلوانبوونێك لە توانای بەرهەمهێنانی وڵاتدا نایەتەدی، ئەم جۆرەی هەڵاوسان بە زۆری دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان دەگرێتەوە، چونکە ئەم دەوڵەتانە ناتوانن قەبارەی بەرهەم هێنرلویان زیاد بکەن لە کاتی زیادبوونی خواستدا بەهۆی ئەوەی دەزگای بەرهەمهێنانیان نەرم نییە.

**٢- هەڵاوسانی تێچوون (Cost puch inflation):**

هەندێك جار بەرهەمهێنەكان ڕووبەڕووی زیادبوونێكی كتوپڕ دەبنەوە لە تێچوونی بنەماكانی بەرهەمهێناندا،ئەویش كاتێ خۆیان لەبەرامبەر سەندیكای بەهێزی كرێكارانی ببیننەوە كە توانای بەرزكردنەوەی ئاستی كرێی كرێكارەكانی هەبێت یان لەوانەیە نرخی هەندێ كەرەستەی خاو بە شێوەیەكی كتوپڕ بەرز بێتەوە، لە هەردوو دۆخەكەدا ئەمە كاریگەرییەكی ڕاستەوخۆ بەجێ دەهێڵێت لەسەر نرخی كۆتایی بەرهەم هێنراوەكان كە زیادبوونی تێچوون لە بنەماكانی بەرهەمهێناندا كە كاری تێكردوون.

ئەم كاریگەرییەش هەستپێكراوتر دەبێت كاتێك زیادبوونی تێچوونی بەرهەمهێنان زۆر بێت، وڵاتانی ئەوروپا بە شێوەیەكی تایبەتی تووشی ئەم دۆخە هاتن كاتێك نرخی سەرچاوەكانی وزە چوار ئەوەندە زیادی كرد لە كاتی قەیرانی نەوت لە ساڵی ١٩٧٣دا، ئەمەش تووشی گێژاوی هەڵاوسانی تێچوونی كردن، چونكە زیادبوونی نرخی وزە كاری كردە سەر هەموو بەرهەم هێنراوەكان و نرخی دەرامەتەكان بە شێوەیەكی گەورە و بەردەوام زیادی كرد لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٣-١٩٧٨. بێگومانی گرانە دەست بەسەر تێچوونەكان دابگیرێت ئەگەر لەو جۆرە بێت كە بنەماكانی بەرهەمهێنان لە دەرەوە هێنرابن، چونكە ئەو دەوڵەتە ناتوانێت نرخی دەرامەتەكان بە شێوەیەكی تەواوەتی كۆنتڕۆڵ بكات، هۆكاری ئەمەش ئەوەیە دەرامەتەكان هەر لە بنەڕەتەوە بەگرانی هێنراون.

**٣- هەڵاوسانی هێنراو (Imported inflation)**

ئەم جۆرەی هەڵاوسان لە ئابوورییە بچووكرلوەكان و تازە پێگەیشتووەكاندا دەردەكەوێت و پێناسەش دەكرێت بەوەی كە (ئەو زیادبوونە خێرا و

بەردەوامەیە بۆ نرخی ئەو شمەك و كارگوزارییە تەواوانەی لە دەرەوە هێنراون، وەك (جلوبەرگی ئامادەكراو، پێڵاو، خۆراكی ئامادەكراو) ، ئەمەش مانای ئەوەیە كە دەوڵەت كۆمەڵێك شمەك و كارگوزاری دەهێنێتە ناوەوە كە خۆیان نرخەكانیان بەرزە و ناچارە لە بازاڕە ناوخۆییەكاندا بەو نرخە بەرزانە بیانفرۆشێتەوە)، ئەم دەوڵەتە ناتوانێت هیچ رۆڵێكی بەرچاو ببینێت لە دیاریكردنی نرخی شمەكە هێنراوەكاندا، لەبەر ئەوەی ئەم دەوڵەتە بەكاریەرێكی بچووكە و ناتوانێت كار بكاتە سەر قەوارەی بازاڕە جیهانییەكان و نرخەكانیان.

٤- هەڵاوسانی نەختینەیی:

هەروەك دەزانین زیادبوونی بڕی پارە لە كۆمەڵگە بێ ئەوەی زیادبوونی قەبارەی بەرهەمهێنانی شمەكی لەگەڵدا بێ دەبێتە هۆی زیادبوونی نرخەكان و دواتر دەبێتە هۆی دابەزینی هێزی كڕینەكەی، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونێكی لەناكاو لە دەستاو دەستكردنی ئەو دراوە، لە كۆتاییدا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی روو لەزیادی نرخی شمەك و كارگوزارییەكان و هەڵاوسانی سەركێش دروست دەكات، چونكە خەڵك پێشبینی ئەوە دەكەن كە هێزی شت كڕینی دراوەكە زیاتر دابەزێت و بەخێراترین كات بیگۆڕنەوە بە دراوێكی تر بەها جێگیر یان زەوی وزار یان زێڕ.

**کاریگەرییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی هەڵاوسان:**

هەڵاوسان چەندین کاریگەری ئابووری و کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، کە دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە پوختەکانیان بخەینەڕوو:

١. هەڵاوسان لاسەنگی لە تەرازووی پارەدان دروست دەکات و بەرەو کورتهێنانی دەبات ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە خواست زۆرە لەسەر هێنراوەکان و قەبارەی نێردراوەکان کەم دەکات، چونکە ئەو زیادەی هەڵاوسانەی لە خەرجی میرییدایە زیادبوونی خواستی لێدەکەوێتەوە کە تەنها شمەکە بەرهەم هێنراوەکانی ناوخۆ ناگرێتەوە، بەڵکو هێنراوەکانیش دەگرێتەوە، هەڵاوسانەکە بەرەو بەرزکردنەوەی تێچوونی بەرهەمهێنانی ئەو شمەکانەش دەچێت کە بۆ ناردنە دەرەوەن، ئەمەش توانای بەربەرەکانی لە بازارە دەرەکییەکاندا لاواز دەکات، بۆیە خواستی دەرەکی لەسەر کەم دەکاتەوەو کورتهێنان دروست دەکات بۆ تەرازووی پارەدان.

٢. بەردەوام بەرزبوونەوەی نرخەکان شڵەژان و پشێوی لە جێبەجێکردنی پرۆژە ئابوورییەکاندا دروست دەکات کە مەحاڵە بتوانرێت تێچوونی دامەزراندنی پرۆژەکان بەشێوەیەکی تەواوەتی دیاری بکرێت کە بەکارهێنراوەکانیان بە بەردەوامی لە کاتی جێبەجێکردنی پرۆژەکەدا بەرزدەبێتەوە، ئەمەش لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە کەرتەکان نەتوانن دەرامەتی پێویست پەیدا بکەن بۆ تەواوکردنی پرۆژەکانیان.

٣. هەڵاوسان دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکان متمانەیان بە دراوەکەیان بێهێز بێت و هاندەری پاشەکەوت کردنیشی لاواز دەبێت، چونکە ئەگەر بەهای پارە بەرەو دابەزینی بەردەوام ڕۆیشت، ئەوا ئەو ئەرکە لەدەست دەدات کە

کۆکەرەوەی بەهایە، ئەمەش حەزی هەڵگرتنی شمەکیان لەلا زیاتر دەکات بەرامبەر بە دراو، بەمەش ئارەزووییان زیاتر بەرەو خەرجکردنی بەکاربردن دەڕوات، ئەوەشی کە دەمێنێتەوە لە دراو دەیگۆڕنەوە بە زێڕ و ئەو دراوە بیانییانەی بەهاکانیان جێگیرە یان ئاراستەی کڕینی شمەکی تەمەن درێژ و زەوی وزاری دەکەن.

٤. هەڵاوسان دەبێتە هۆی دووبارە دابەشکردنەوەی داهات:

بەرزبوونەوەی ئاستەکانی نرخ دەبێتە هۆی دابەزینی هێزی کڕین لای ئەو کەسانەی داهاتەکانیان دیاری کراوە کە زۆرینەی کۆمەڵگە پێك دەهێنن لە کاتێکدا خاوەن زەوی و زار و خانوبەرە و پیاوانی کار کە کەمینەن لە کۆمەڵگەدا هەڵاوسانەکە دەبێتە هۆی زیادبوونی داهاتەکانیان‌و دابەش کردنەوەی داهاتەکە بە شێوەیەك دەبێت کە لە بەرژەوەندیان بێت.

## چارەسەری هەڵاوسان:

دەتوانرێت بە چەند شێوازێکی جیاواز چارەسەری هەڵاوسان بکرێت کە گرنگترینیان ڕامیاری نەختینەیی و ڕامیاری دارایی و ڕامیاری دەستێوەردانی ڕاستەوخۆیە و ئەم ڕامیاریانەش خۆیان لەم کار ڕاپەڕاندانەی خوارەوەدا دەبینێتەوە:

### ١- ڕامیاری نەختینەیی:

ئەو ڕامیارییەیە کە پەیوەندی بە دراو ودەزگای بانکەوە هەیە وکاردەکاتە سەر خستنەڕووی دراو تا قەبارەی هێزی شت کڕین فراوان بکات یان کەم بکاتەوە، وا لە خوارەوە بەکورتی باسی ئامرازەکانی ڕامیاری نەختینەیی دەخەینە ڕوو:

أ- نرخی سوو: ئەو نرخەیە کە بانکە بازرگانییەکان لەگەڵ کەسەکاندا مامەڵەی پێ دەکەن واتە ئەو نرخی سوووەیە کە بانکە بازرگانییەکان لە کاتی بەخشینی قەرزەکان و ئاسانکارییە متمانییەکاندا بۆ کەسەکان دەستیان دەکەوێت و ئەوەشە کە کەسەکان لە بەرامبەر پاشکەوتەکانیان لای بانکە بازرگانییەکان دەستیان دەکەوێت.

بانکە بازرگانییەکان پابەند دەبن بە بەرزترین ئاستی نرخی سووە کە بانکی مەرکەزی دیاری دەکات و لە کاتی هەڵاوساندا نرخی سوو بەرز دەکرێتەوە لەسەر سپاردەکان تا هانی کەسەکان و دەزگاکانی پێبدرێت بۆ دانانی پارەکانیان، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە گەورەترین رێژەی پارە لە بازارەکاندا بکێشێتەوە و لە بانکی مەرکەزیدا هەڵبگیرێت، بەڵام لەکاتی داکشانەوەدا بە پێچەوانەیە.

ب- رێژەی یەدەگی دراوی یاسایی (رێژەی یەدەگی نەختینەیی یاسایی): بریتییە لەو رێژە پارەیەی کە پێویستە بانکی بازرگانی بەپێی یاسا لە بانکی مەرکەزیدا هەڵی بگرێت، ئەو رێژە پارەیەش هیچ سوودێکی ناچێتەسەر.

ئەوەی بەڵگە نەویستە ئەوەیە کە گۆڕانی ئەو رێژەیە کار دەکاتە سەر پاشماوەی هەر سپاردەیەك لای بانکی بازرگانی، لە پاشاندا کار دەکاتە سەر توانای ئەم بانکانە بۆ قەرزدان و دابینکردنی دراو بۆ دەستاو دەستکردن لە ئابووری نیشتمانیدا.

لێرەدا لەکاتی هەڵاوسان بانکی مەرکەزی هەڵدەستێت بە بەرزکردنەوەی رێژەیی یەدەگەکە بۆ ئەوەی قەبارەی پارەی ماوە لەلای بانکە بازرگانییەکان کەم بکاتەوە، بەمەش کار دەکاتە سەر قەبارەی قەرزدان و خستنەڕووی پارە لە گەڵیدا بەهای پارەکەش بەرز دەبێتەوە.

ج- کردارەکانی بازاڕی کراوە(لەسەرپشت): ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێت کە بانکی مەرکەزی هەڵدەستێت بە کڕین یان فرۆشتنی قەباڵە میرییەکان بە ئامانجی ئەوەی ڕاستەوخۆ کاری بکاتە سەرقەبارەی یەدەگە نەختینەییەکان لای بانکە بارزگانیەکان.

لە کاتی هەڵاوساندا بانکی مەرکەزی ئەم قەباڵانە بە بانکە بازرگانییەکان دەفرۆشێت، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی قەبارەی یەدەگە نەختینییەکان و کەمبوونەوەی تواناکانی قەرزدانیان، لە کۆتاییدا کەمبوونەوەی خستنەڕووی پارە.

٢- ڕامیاری دارایی:

مەبەست لە (ڕامیاری دارایی) لە دیاریکردنی سەرچاوە جیاوازەکانی دەسهات گشتییەکانی دەوڵەت و دیاریکردنی بایەخی هەریەکە لەو سەرچاوانە لەلایەك و لە لایەکی ترەوە دیاریکردنی ئەو ڕێگایانەی کە ئەم دەسهاتانەی پێ بەکار دەهێنرێت لە پارەدارکردنی خەرجییەکانی میریدا، گرنگترین ئامرازەکانی ڕامیاری دارایی ئەمانەیە:

أ- زیادکردنی باجەکان: باج یەکێکە لەو هۆپێناوانەی (ڕێگایانەی) کە بەکاردەهێنرێت لە ڕووبەڕووبونەوەی هەڵاوسان و بێ بازاڕی، جا ئەو باجە لەسەر داهاتی باجەکانی سەرشمەك و کارگوزرای سەپێنرلو بێت. باج بە کاریگەرترین هۆپێناو دادەنرێت لە چارەسەرکردنی هۆکارەکانی هەڵاوساندا، لەبەر ئەوەی توانای شت کڕینی کەسەکان و دەستەکان کەم دەکاتەوە و کاردەکاتە سەر ئارەزووی بەکاربردن، پاشانیش کەمبوونەوەی خەرجی بەکاربردن، ئەمەش مانای ئەوەیە خواستی هەمووەکی کەم دەکات کە کارێکی ڕاستەوخۆی دەکردە سەر هەڵاوسانەکە.

ب- کەمکردنەوەی خەرجی میری: ئاشکرایە ئەو خەرجکردنەی کە میری ئەنجامی دەدات دوو جۆرن کە ئەمانەن: (خەرجی بەگەڕ – خەرجی وەبەرهێنان) سەرجەمی خەرجی میری بەشێکی گەورە پێك دەهێنێت لەسەرجەمی خەرجی هەمووەکیدا، لەبەر ئەوە کەمکردنەوەی خەرجی میری واتە کەمکردنەوەی خواستی هەمووەکی (خەرجی هەمووەکی) یە لەسەر شمەك و کارگوزارییەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی توندی هەڵاوسانەکە و کەمکردنەوەی کاریگەریە ئابوورییەکانی.

٣- ڕامیاری دەستێوەردانی ڕاستەوخۆ: مەبەست لەم ڕامیارییە ئەو کار ڕاپەڕاندنانەیە کە دەوڵەتەوە بەکاری دێنێ بۆ گۆڕینی هەڵاوسانی کراوە بۆ هەڵاوسانێکی کپکراو.

## داکشانەوە: ( Deflation )

**داکشانەوە (دیاردەیەکی ئابوورییە کاتێك ڕوو دەدات کە سەرجەمی خەرجی بۆ کڕینی بەکاربردن و وەبەرهێنان (خواستی هەمووەکی) کەمتر بێت لە توانای بەرهەمداری بۆ ئابووری نەتەوەیی).**

**هۆکارەکانی داکشانەوە:**

چەند هۆکارێك هەیە بۆ دەرکەوتنی ئەم دیاردە ئابوورییە گرنگترینیان ئەمانەیە:

أ- هۆکارە سروشتییەکان: مەبەست لە هۆکارە دروست نەکراوەکانەکە و هیچ ڕامیارییەکی ئابووری میری لە پشتەوە نییە، وەك ئەو داکشانەوەیەی کە لە دەوڵەتێکدا ڕوودەدات بەهۆی ڕوودانی دیاردە سروشتییەکانی وەك بومەلەرزە و لافاو و گەردەلوولە کاولکارەکان کە کاردەکەنە سەر گشت جموجۆڵە ئابوورییەکان لەو دەوڵەتەدا.

ب- هۆکارە ئابوورییەکان: مەبەست ئەو هۆکارانەیە کە بەهۆی ڕامیارییە ئابوورییەکانەوە پەیدا دەبن کە میری پەیڕەویان دەکات، بۆ نموونە لەکاتی چارەسەری هەڵاوساندا، میری ڕامیارییەکی نەختینەیی تایبەت پەیڕەو دەکات ئەویش کەمکردنەوەی خستنەڕوو و دەستاو دەستکردنی دراوە، ئەمەش بۆ کەمکردنەوەی متمانەپێدان و قەرزەکانە، ئەگەر میری لەسەر ئەم ڕامیارییە بەردەوام بێت، ئەوا داکشانەوەی لێ دەکەوێتەوە یان ئەگەر میری بڕیار بدات دەرامەتە داراییەکان ڕابگرێت کە بڕیاریان لەسەر دراوە، ئەمەش بە مەبەستی کەمکردنەوەی نرخەکان و جێگیرکردنی بەهای نەختینەیی بۆ دراوەکە.

ج- هۆکارە رامیارییەکان: **جێگیرنەبوونی باروودۆخی رامیاری یان جەنگ دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی ئاستی گوزەرانی دانیشتوان و کەمبوونەوەی خواستیان ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە کەرتی تایبەتیش بەهۆی خراپی باروودۆخەکەوە بەرهەمهێنانیان کەم دەکەنەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی زۆربوونی بێکاری و دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئابووری وڵات بەرەو داکشان و بێ بازاڕی بڕوات.**

**کاریگەری داکشانەوە:**

**١. داکشانەوە پاڵ بەبەرهەم هێنەکانەوە دەنێت بۆ کەمکردنەوەی بەرهەمهێنانیان و لەکارخستنی بەشێك لە وزەی بەرهەمدارییان، ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی قەبارەی بەکارخستن و کەمبوونەوەی داهاتە دابەشکراوەکان و سەرەنجام دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خواستی هەمووەکی و ئاستی چالاکی ئابووریش بەرەو خراپبوون دەڕوات تا دەگاتە قۆناغی بێ بازاڕی.**

**٢. بەرزبوونەوەی تێکڕای بێکاری و نزمبوونەوەی ئاستی بەرهەمی نەتەوە و داهاتی نەتەوەیی.**

**٣. لەوانەیە سەرهەڵدانی داکشانەوە پاڵ بە سەرمایەی نیشتمانییەوە بنێت بۆ وەبەرهێنان لە دەرەوە لە جیاتی بەکارخستنی لە ناوخۆدا.**

**چارەسەری داکشانەوە:**

**ئەو ئابوورییەی کە بە دەست داکشانەوەوە دەناڵێنێت (واتە کورتهێنانی قەبارەی خەرجی هەمووەکی لە ئاست بەرهەمی نەتەوەییدا) دۆخێکی ناهاوسەنگە و ئەو جیاوازییەی لە نێوان قەبارەی داهاتی نەتەوە و خەرجی نەتەوە دروست دەبێت پێی دەوترێت** (کەلێنی داکشانەوە)**، ئەگەر وا دابنێین**

که داهاتی نەتەوە(٢٥٠ ملیۆن دۆلار) و ( خەرجی نەتەوە ٢٤٠ ملیۆن دۆلار) بێت ئەوا ئەو جیاوازیەی کە دەکاتە(١٠ملیۆن دۆلار) کەلێنی داکشانەوەکە دەنوێنێت.
لەکاتی چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیەدا پێویستە ئاستی خەرجییەکان بەرز بکرێتەوە تا بگاتە ئاستی داهاتی نەتەوە، ئەوەش ئاستی هاوسەنگییەکەیە و دەتوانرێت ئەو زیادەیە لە قەبارەی خەرجییەکاندا بەم ڕێگایانە بهێنرێتەدی:

١. فراوانکردنی خەرجییەکانی میری (خەرجی بەگەڕ – خەرجی وەبەرهێنان):
ئەم فراوانکردنە زیادکردنێك لە قەبارەی خواستی هەمووەکی دەنوێنێت کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی کەلێنی داکشانەوەکە یان نەهێشتنی، چونکە کاتێ میری هەڵدەستێت بەزیادکردنی خەرجییەکان واتە دابەشکردنی داهاتی نوێیە بەسەر هەندێك بنەمای بەرهەمهێنان واتە زیادکردنی توانای شت کڕینیان، ئەمەش کار دەکاتە سەر بەرزکردنەوەی ئارەزووی بەکاربردن و لە پاشاندا زیادبوونی خەرجکردن بۆ شمەك و کارگوزارییەکان و، ئەمەش قەبارەی خواستی هەمووەکی زیاد دەکات.

٢. کەمکردنەوەی باجەکان:
کەمکردنەوەی باجەکان واتە زیادبوونی داهاتی ڕەخساوە بۆ خەرجکردن، چونکە ئەگەر میری ئەم کارە ئەنجامبدات ئەوا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی زیادکردنی توانای شت کڕینی کەسەکان، ئەمەش مانای بەرزکردنەوەی ئاستی ئارەزووی بەکاربردن و زیادبوونی خەرجی بەکارهێنانە، لەمەشەوە کەمکردنەوەی باج یان نەهێشتنی دەبێتە هۆی زیادبوونی قەبارەی خواستی هەمووەکی، لە پاشاندا بچووکبوونەوەی کەلێنی داکشانەوەکە یان نەمانی.

٣. کەمکردنەوەی نرخی(سوو) لەلایەن بانکی ناوەندییەوە:
کاریگەرترین ڕێگەیە بۆ چارەسەرکردنی داکشانەوە، چونکە کەمکردنەوەی نرخی سوو دەبێتە هۆی هاندانی کەرتی تایبەت بۆ قەرزکردن و فراوانکردنی وەبەرهێنان و دامەزراندنی کارگەی نوێ، بەمەش بواری کارکردن بۆ کرێکاران دەرەخسێت و داهاتی نوێ بەسەر خەڵکدا دابەش دەبێت و خواست زیاد دەکات و چالاکی ئابووری گەشە دەکات، وەك( ئەمەریکاو وڵاتانی ئەوروپا و ژاپۆن و زۆریەی دەوڵەتانی تری جیهان بۆ چارەسەرکردنی ئەم (داکشانەوە و بێ بازارییەی ئابووری جیهانی گرتەوە لە ساڵانی (٢٠٠٨) پەنایان بردە بەر (کەمکردنەوەی نرخی سوو).

## پرسیارەکانی بەشی یەکەم

١. پێناسەی ئەمانە بکە: (داهاتی ڕاستەقینە – داهاتی تاکەکەس – داهاتی نەتەوەیی – بارگۆڕانی ئابووری – بەرهەمهێنان – هەڵاوسان – دلکشانەوە).

٢. پێکهێنەرەکانی داهاتی نەتەوەیی کامانەن؟

٣. ئەو هۆکارانە دیاری بکە کە ئاستی داهاتی نەتەوەیی دیاری دەکات؟

٤. باس لە ڕۆڵی هەریەکە لە (کەرتی کەسەکان وکەرتی بەرهەمهێنان) بکە لە چالاکی بەرهەمهێنان؟

٥. ئەو گیروگرفتانە کامانەن کە تووشی شارەزاکان دەبن لە کاتی حسابکردنی داهاتی نەتەوەدا.

٦. بارگۆڕانی ئابووری پێناسە بکە و قۆناغەکانی بە هێلکاریەوە دیاری بکە؟

٧. مەبەستمان لە (کەمبوونەوەی بەکاربردن) چییە؟

٨. مەبەستمان لەم زاراوە ئابوورییانە چییە؟

(هەڵاوسانی هاوردە – بەهای زێدەدانراو – کەلێنی دلکشانەوە)

٩. جیاوازی نێوان ئەمانە بکە:

أ– داهاتی نەتەوە و بەرهەمی نەتەوە.

ب– داهاتی نەختینەیی و داهاتی ڕاستەقینە.

ت– هەڵاوسان و دلکشانەوە.

پ– داهاتی دانەشکاو و داهاتی ڕەخساو.

١٠. شوێنەوارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی هەڵاوسان کامانەن؟

١١. هەڵاوسانی تێچوون چۆن لێك دەدەیتەوە؟

١٢. دیاردەی هەڵاوسان چۆن چارەسەر دەکرێت لەڕێگای (ڕامیاری نەختینەیی ڕامیاری دارایی)ەوە؟

| ئينگليزى | عەرەبى | كوردى |
|---|---|---|
| National Income | الدخل القومي | داهاتى نەتەوە |
| Personal Income | دخل الفرد | داهاتى تاكەكەس |
| National product | الناتج القومي | بەرهەمى نەتەوەيى |
| Production | الانتاج | بەرهەمهێنان |
| Monetary Income | الدخل النقدي | داهاتى نەختينەيى |
| Real Income | الدخل الحقيقي | داهاتى راستەقينە |
| Value Added | القيمة المضافة | بەهاى زێدەدانراو |
| Input | المستخدمات | بەكارهێنراوەكان |
| Income Disturputed | الدخل الموزع | داهاتى دابەشكراو |
| Expendituer | الانفاق | خەرجى |
| Economic Fluntution | التقلبات الاقتصادية | بارگۆڕانى ئابوورى |
| Recession | الركود | داكشانەوە |
| Depression | الكساد | بىٚ بازاڕى |
| Recovery | الانتعاش | بووژانەوە |
| Boon | الازدهار | برەوسەندن |
| Consumption | الاستهلاك | بەكاربردن |
| Inflation | التضخم | هەڵاوسان |
| Demand push in flation | تضخم الطلب | هەڵاوسانى خواست |
| Cost push in flation | تضخم الكلفة | هەڵاوسانى تێچوون |
| Imported inflation | التضخم المستورد | هەڵاوسانى هاوردە |
| Deflation | الانكماش | داكشانەوە |

# بەشی دووەم
# بازرگانی
# TRADE

سەرەتا:

پاش ئەوەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێشکەوت و کەسەکان پسپۆڕیان وەرگرت لە بەرهەمهێنانی شمەکی دیاری کراودا دوو شت لایان دەرکەوت:

یەکەمیان: بڕی شمەکێکیان بەرهەم دەهێنا کە زیاتر بوو لە پێویستی خۆیەوە.

دووەمیان: پێویستیان بە شمەکێکی دیکە هەبوو کە پسپۆڕ نەبوون لە بەرهەمهێنانیدا، لە بەر ئەمە ئەو شمەکەی لە پێویستی خۆیان زیاتر بوو بیگۆڕنەوە بەو شمەکانەی کە پێویستییان پێیەتی یان (دەگمەنە). ئەم گۆڕانەی لە پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان کەسەکان ڕوویدا سەرەتای دەرکەوتنی بازرگانی بوو لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا.

## پێناسەی بازرگانی:

بریتییە لە کرداری کڕین و فرۆشتنی (ئاڵوگۆڕی) شمەك و کارگوزارییەکانە کەلە ناوخۆ یان لە نێوان دەوڵەتەکان ڕوودەدات، ئەوەی بەم کارە هەڵدەستێت پێی دەوترێت (بازرگان).

بازرگان: ئەو کەسەیە کە بە شێوەیەکی هەمیشەیی (بەردەوام) پیشەی بازرگانی بێت جا ئەو کەسە کەسێکی ئاسایی بێت یان مەعنەوی.

بازرگانیش دابەش دەکرێت بۆ دوو بەشی سەرەکی:

١-بازرگانی ناوخۆ: مەبەست لێی کرداری ئاڵوگۆڕ (کڕین و فرۆشتن)ە کە لەناو سنووری جوگرافی یەك دەوڵەتدا ئەنجام دەدرێت، دابەش دەکرێت بۆ دوو بەش:

أ- بازرگانی سەرجەم: ئەو کردارە ئاڵوگۆڕ کردنانەیە کە لە نێوان بازرگانەکان خۆیان دا ڕوو دەدەن و کڕین فرۆشتن تیایدا بە بڕی گەورەو زۆرە، نرخیش لە بازرگانی سەرجەم کەمترە وەك لە بازرگانی وردە.

ب- بازرگانی وردە (دانە): ئەو کردارانەیە کە لە نێوان بازرگانی وردەو بەکاریەرەکاندا ڕوو دەدات و کرداری کڕین و فرۆشتنەکەش بڕەکەی کەم و دیاری کراوە، نرخیش لە بازرگانی وردە زیاترە وەك لە بازرگانی سەرجەم هەیە.

٢- بازرگانی دەرەکی: ئەو کرداری ئاڵوگۆڕ کردنانەیە کە لە سنوورە نێو دەوڵەتییەکاندا ئەنجام دەدرێت، واتە: گۆڕینەوەی شمەك و کارگوزارییە لەنێوان دەوڵەتاندا، بازرگانی دەرەکی لە سادەترین شێوەیدا بریتییە لە کردارەکانی هێنان و ناردن ، کەواتە بازرگانی دەرەکی پێك دێت لە:

یەکەم: کۆمەڵەی نێردراوەکان (export) لە دوو بەش پێکدێن:

أ- نێردراوی شمەك یان نێردراوی بینراو:ئەو نێردراوە بینراون کە تاك دەتوانێ بیان بینێ وەك ئۆتۆمبێل و ئامێرو خواردەمەنی و جلوبەرگ.

ب- نێردراوی خزمەتگوزاری یان نێردراوی نەبینراو: لەو نێردراوانە پێکدێت کە تاکەکان ناتوانن بیانبینن وەك خزمەتگوزاری گەشتوگوزار و بانکەکان و گواستنەوە و میوانخانەکان.

دووەم: کۆمەڵەی هێنراوەکان (هاوردەکراو) (import) بەهەمان شێوە لە دوو بەش پێکدێت:

أ- هێنراوی شمەك یان هێنراوی بینراو.

ب-هێنرلوی خزمەتگوزاری یان هێنراوی نەبینراو.

**لەچەند رووێکەوە بازرگانی ناوخۆ لە بازرگانی دەرەکی جیاوازترە:**

لێرەدا دەمانەوێت بەکورتی هۆکارەکانی جیاوازی نێوان بازرگانی ناوخۆو بازرگانی دەرەکی بخەینە ڕوو کە ئەمانەن :

**١- بازرگانی ناوخۆ لە نێوان کەسەکان و یەکە ئابوورییەکانی ناو یەك سنووری سیاسی (ڕامیاری ) ئەنجام دەدرێت،** بەلام بازرگانی دەرەکی لە نێوان ئەو کەس و یەکە ئابوورییانەدا ئەنجام دەدرێن کە سەر بە دەوڵەتی جۆراو جۆرن (جیاوازن).

**٢- کەسەکان سەر بە چەند یەکەیەکی سیاسی جیاوازن** و ملکەچی کۆمەڵێك یاساو ڕێسای جۆراوجۆرن و هەر دەوڵەتێك لەو دەوڵەتانەش ڕامیاری ئابووری تایبەت بە خۆی هەیە پەیرەوی دەکات و دەیەوێت چەند ئامانجێکی نەتەوەیی و نیشتمانی بەدەست بهێنێت وەك بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی ئابووری بۆ هاولاتیانی خۆی، لەهەمانکاتدا میری ئەوە لەبەرچاو دەگرێت کە جیاوازی لە نێوان ئەو کەسانە نەکات کە هەڵگری هەمان رەگەزنامەی ئەو دەوڵەتەن، بەلام سوورە لەسەر مامەڵەکردنی بیانییەکان بەشێوەیەك کە جیاوازە لەو مامەڵەیەی لەگەڵ هاولاتیانی خۆیدا دەیکات.

**٣- جیاوازی سروشتی بازاڕەکان** یەکێکە لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە کاریگەرییەکی ئاشکرای لەسەر سروشتی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و جیاوازی

بازاڕەکـان لـە نێـوان دەوڵەتـەکان هەیـە، ئـەویش خـۆی لـە جیـاوازی حـەزو ئـارەزوو و تایبەتمەنـدی ژینگـەکانیان دەبینێتـەوە، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی سەرهەڵدانی ناچۆنییەکی لە هەڵبژاردنی شمەك و کارگوزارییەکان، سـەرەڕای ناچۆنییەکی لە بـوونی بەربەسـتە سروشـتی و کـارگێڕی و ڕامیارییـەکان وەك دووری جـوگرافی کـە دەبێتـە هـۆی بەرزکردنـەوەی تێچـوونی گواسـتنەوەو کارڕاپەڕاندنـە کارگێڕییـەکان کـە دێتـە ڕێگـەی گواسـتنەوەی شمەکـەکان لەڕێگەی سنووری ڕامیاری (وەك ئەو بەڵگەنامە تەندروسـتیانەی دەسـەلمێنن کە شمەکـە هێنراوەکـان دوورن لـە هـەموو نەخۆشـییەك و پیسـبوونێك) یـان بەربەستە ئابوورییەکانی (وەك ڕەسمی گومرگی) ئەمانـە هـەموو هۆکـارن بـۆ جیاکردنەوەی بازاڕەکان لە یەکتری٠

**٤- جیاوازی یەکە نەختینەییەکان و سیستەمی بانکی لە نێوان دەوڵەتەکاندا**

بـە هۆکـارێکی جیاکردنـەوەی دەوڵەتـەکان دادەنرێـت، هـەر وڵاتێـك ئـامرازی دارایی و بانکی و دراوی نیشـتمانی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە کـە لـە وڵاتێکـی دیکەی جیا دەکاتەوە، ئەمەش لە ڕێگەی خۆیەوە دەبێتە هـۆی ناچـۆنییەکی جیاوازی لە بازرگانی ناوخۆو دەرەکی دا، چونکە لە کـاتی بـوونی پـەیوەنـدی بازرگانی لەنێوان دوو دەوڵەتـدا ناچـارین کـرداری گۆڕینـەوەی دەرەکـی یـان گۆڕینەوەی دراو بە دراوێکی تر ئەنجام بدەین و ئەگـەرێکی گـەورە هەیـە کـە نرخـی دراو گۆڕینـەوە بگۆڕێـت یـان سەربەسـتی دراو گۆڕینـەوە بوەسـتێت ئەمـەش دەبێتـە هـۆی ئـەوەی کـە بازرگـانی دەرەکـی تووشـی مەترسـی نەختینەیی بێت، کەئەمە لە بازرگانی ناوخۆدا نییە، چونکە لە سـنووری ئـەو دەوڵەتەدایەو یەك دراو بەکاردێت٠

**٥- توانای گواستنەوەی کرێکار و سەرمایە لە ناوخۆ و دەرەکیدا جیاوازە،** چونکە گواستنەوەی بنەماکانی بەرهەمهێنانی وەك کارو سەرمایە لە ئابووری نشتیمانی یان لە چوارچێوەی سنووری جوگرافی ولاتێك زیاتر سەربەست دەبێت، بەلام سەربەستی گواستنەوەیان لە نێوان دەولەتەکاندا دیاری کراو دەبێت، ئەمەش بەهۆی ئەو گیروگرفتانەوە دەبێت کە دێتە ڕێگەیان وەك گیروگرفتی کارگێڕی و ئەو گیروگرفتانەی کە پەیوەندییان بە جیاوازی زمان و نەریت و پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان و یاساکان هەیە کە ڕێگرن لەبەردەم گواستنەوەی کرێکار، سەرەڕای ئەو تێچوونە زۆرەی کە پێویستە بۆ ئەو گواستنەوەیە لە دەولەتێکەوە بۆ دەولەتێکی تر.

سەرمایە بەئاسانی لە دەولەتێکەوە بۆ دەولەتێکی تر ناگوێزرێتەوە، چونکە خاوەن سەرمایەکان وەبەرهێنانیان لە ولاتەکانیان پێ باشترە لە ترسی ئەو بارگرژییە ڕامیاری و ئابوورییانەی کە لەوانەیە لە دەرەوە رووبدات، هەروەها بە ئاسانی دەتوانن سەرپەرشتی سەرمایەکانیان بکەن لە ولاتەکانیاندا.

## هۆیەکانی دروستبوونی بازرگانی دەرەکی:

دوو هۆکاری سەرەکی هەیە بۆ دروستبوونی بازرگانی دەرەکی کە ئەمانەن:

١- **هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت پێداویستییەکانی خۆی پڕبکاتەوە:** گرانە بەدەرامەتە ناوخۆییەکان هەموو پێداویستییەکانی دەوڵەت پڕبکرێتەوە، بەتایبەتیش پاش زۆربوونی پێداویستییەکانی ئادەمیزاد و جۆراوجۆربوونیان و جیاوازی توانای دەوڵەتەکان لە دابینکردنی پێویستییەکان لە پاڵ جۆرلو جۆری ئارەزووەکانی کەسەکاندا.

٢- **ئەو دەسکەوت و چاکانەی کە لە ئەنجامی بازرگانییەوە بەدەست دەهێنرێن:** دەوڵەت هەڵدەستێت بەناردنە دەرەوەی ئەو شمەکانەی کە زیادەیەکی رێژەییان هەیە و هێنانی ئەو شمەکانەش کە دەگمەنی رێژەییان هەیە.

## گرنگی بازرگانی دەرەکی:

کەرتی بازرگانی بەبەشێکی گرنگی پەیکەریەندی ئابووری نەتەوە و بازرگانی دەرەکیش دادەنرێت، چەند گرنگیەکی گەورەی هەیە کە دەتوانین پوختەکەی بەم شێوەیەی خوارەوە بخەینە روو:

١- بازرگانی دەرەکی دەرفەت بۆ هەموو ولاتێك دەرەخسێنێت تا ئەو شمەکانە پەیدا بکات کە لای دەست ناکەوێت، جا بە هۆی بارودۆخی ئاو و هەولوە بێت یان بێ توانایی سروشتییەکەی ناتوانێ بەرهەمی بهێنێت.

٢- بازرگانی دەرەکی بە هۆکارێکی گرنگی ولاتە تازە پێگەیشتووەکان دادەنرێت کە هەوڵی پەرەپێدانی ئابووری دەدەن، چونکە بازرگانی دەرەکی دەرفەت بۆ ئەم دەوڵەتانە دەرەخسێنێت تا لە دەوڵەتە پیشەسازی و پێشکەوتووەکان قەرزیان دەست کەوێت، قەرزدانی

نێودەوڵەتیش شێوەیەکە لە شێوەکانی گواستنەوەی شمەك و کارگوزارییە پێویستییەکانی وەك ئامێرو مەکینە کە بۆ هێنانەدی پەرەپێدانەکە گرنگە.

٣- بازرگانی دەرەکی بە سەرچاوەیەکی داهاتی زۆریەی دانیشتوان دادەنرێ، جالە رێگەی ئەو چالاکییە ڕاستەوخۆیانەوە بێت کە پەیوەستە بە کردارەکانی هێنان و ناردنە دەرەوە بێت، یاخود لەڕێگەی چالاکییە یارمەتیدەرو تەواوکەرانەوەی وەك گواستنەوەو هەڵگرتن و داگرتن...هتد بێت.

٤- بازرگانی دەرەکی ئامرازێکە بۆ نزیککردنەوەی ماوە دوورەکان و سنوورەکانی نێوان دەوڵەتەکان دەبڕێت و بەتایبەتیش لەسایەی پێشکەوتنی هۆیەکانی گەیاندن و پەیوەندییە تەلدار و بێ تەلەکان.

## بنەماکانی دروستبوونی پسپۆری نێو دەوڵەتی:

بنەڕەتی دامەزراندنی پسپۆربوونی نێو دەوڵەتی و پاشانیش ئاڵوگۆڕی لە نێوان دەوڵەتەکان بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە کە دەتوانرێت لەمانەدا کۆیان بکەینەوە:

١- ئاو و هەوا:

بە شێوەیەکی گشتی کەشو هەوا کاریگەری لە سەر تێچوونی بەرهەمهێنان و بە شێوەیەکی تایبەت خەرجییەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی هەیە، بۆ نموونە گەرمی و تێکڕای بڕی باران بارین لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر جیاوازە، بۆیە ئەمەش کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر بەرهەمی کشتوکاڵی دەبێت، ئەمەش لەلایەن خۆیەوە رۆڵی دەبێت لە دیاریکردنی پسپۆربوون و ئاڵوگۆڕی نێودەوڵەتیدا.

٢- ناچۆنیەکی لە دەرامەتە سروشتییەکان:

دەوڵەتان جیاوازییەکی گەورەیان لە نێواندا هەیە لەبارەی دەرامەتانەی کە سروشت پێ بەخشیوون لە زەوی کشتوکاڵی و کانزاکانی وەك ئاسن و مس و خەڵوز و نەوت، ئەو دەوڵەتانەی کە زەوی کشتوکاڵیان هەیە پسپۆر دەبن لە بەرهەمهێنانی چەند بەروبومێکی کشتوکاڵی، وەك پسپۆڕبوونی کەنەدا و ئوستڕالیا لە گەنم و میسر لە لۆکەدا، ئەو دەوڵەتانەی کە کێڵگەی نەوتیان هەیە پسپۆڕ دەبن لە بەرهەمهێنانی نەوتدا، وەك عێراق و دەوڵەتەکانی کەنداوی عەرەبی.

٣- ناچۆنیەکی لەتوانا مرۆییەکان:

زۆری دەستی کرێکار لەو دەوڵەتانەی کە چڕی دانیشتوانیان زۆرە، دەبێتە هۆی زیادبوونی دەستی کرێکار و بەمەش نزمی کرێ دێتە کایەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی سەرکەوتنیان لە بەرهەمهێنانی ئەو شمەکانەی کە دەستی کاری زۆری پێویستە و دروستکردنیان ئاسانە و شارەزای هونەری و سەرمایەی زۆری ناوێت وەك پیشەسازی ڕستن و چنین لە هیندستان و پاکستان و میسر، بەڵام ئەو دەوڵەتانەی بەدەست کەمی دەستی کارەوە دەناڵێنن ئەوا خواست لەسەر دەستی کار، دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی کرێ، بەمەش ڕوو لە پسپۆڕبوونی ئەو پیشەسازییانە دەکەن کە سەرمایەی چڕی(زۆری) پێویستە، گەر کەرەستەی خاو و سەرمایەو شارەزای هونەرییان تێدا هەبێت وەك پسپۆڕبوونی بەریتانیاو ئەڵمانیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بەرهەمهێنانی پاپۆڕ و شەمەندەفەر و ئۆتۆمبێل... هتد.

**٤- ناچۆنیەکی لە بڕی سەرمایەی بەردەست:**

سەرمایە هۆکارێکە بۆ ناچۆنیەکی بەرهەمهێنان لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر، هەندێك لەو دەوڵەتانەی کە پشتێنەیەکی (رەصیدێکی) گەورەی سەرمایەیان هەیە، وا چاوەڕوان دەکرێت ئەو وڵاتانە پسپۆر بن لە بەرهەمهێنانی شمەکی وەبەرهێنان وەك ئامێرو ئامرازەکان و شمەکەکانی دیکە کە سەرمایەیەکی زۆریان پێویستە، بەڵام سەبارەت دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان کە بەدەست دەگمەنی رێژەیی سەرمایەوە دەناڵێنن (جگە لەو دەوڵەتانەی نەوت دەنێرنە دەرەوە) ئەوا پێشکەوتنی پیشەسازییان بە شێوەیەکی تایبەتی تەگەرەی تێ دەکەوێت و ناچاریان دەکات پسپۆڕین لەو پیشەسازییە سادەو ساکارانەی کە کرێکاری زۆریان پێویستە.

# بیردۆزەکانی بازرگانی دەرەکی

## ١- بیردۆزی تێچوونە ڕەهاکان (لەباری ڕەها):
The Theory Of Absolute Costs

بازرگانی دەرەکی بەپێی بیروڕای (ئادەم سمث) کە خاوەنی ئەم بیردۆزەیە یارمەتی هەر دەوڵەتێك دەدات کە پسپۆر بێت لە بەرهەمهێنانی ئەو شمەکەدا کە بارودۆخی سروشتی و کەش و هەوا و ئادەمیزادەکانی لەبارە و بیگۆڕێتەوە بەو شمەکەی کە پێویستی پێیەتی و پسپۆر نییە تیایدا.

ئادەم سمث ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێت: (کاردابەشکردنی نێودەوڵەتی دەوڵەت ناچار دەکات کە پسپۆر بێت لە بەرهەمهێنانی ئەو شمەکەی کە هەلومەرجە سروشتییەکان (خاك و ئاو و هەوا) و ئادەمیزادییەکان یارمەتی بدات کە باری ڕەهای هەبێت لە بەرهەمهێنانی دلو ئینجا ئەو زیادەی لە پێویستییەکانی هەیە بیگۆڕێتەوە بەو شمەکانەی کە دەوڵەتەکانی تر لە پێویستی خۆیان زیاترە و هەمان لە باری ڕەهایان هەیە).

ئادەم سمث لە ڕوونکردنەوەکەیدا گریمانی ئەوە دادەنێت کە دوو دەوڵەت هەیە (ئینگلترا و هندستان) دوو شمەك بەرهەم دەهێنن ئەوانیش ڕستن و چنین و برنجە و تێچوونە ڕەهاکانیان (کاتژمێری کار) بەم جۆرەی خوارەوەیە:

| دەوڵەت | برنج | ڕستن و چنین |
|---|---|---|
| ئینگلتەرا | ٥٠ | ٤٠ |
| هیندستان | ٢٠ | ٨٠ |

له نموونەکەی سەرەوەدا دوو دەوڵەت هەیە کە (ئینگلترا و هیندستان)ە و دوو شمەکی (برنج و رستن‌و چنین) هەیە و لە پێناو بەرهەمهێنانی یەك یەکە برنج لە ئینگلترا پێویستیان بە (٥٠ کاتژمێر کارە) و لە هیندستان پێویستی بە (٢٠ کاتژمێر کارە)، بەمەش تێچوونی بەرهەمهێنانی برنج لە ئینگلترا بەرز ترە بە بەراوردکردن لەگەڵ هیندستان وەیەك یەکە لەرستن و چنین دەتوانرێت لە ئینگلترا بە (٤٠ کاتژمێری کارە) بەرهەمبهێنرێت، بەلام لەهەمان کاتدا هیندستان پێویستی بە (٨٠ کاتژمێری کارە)، لەمەشەوە هیندستان نابێتە خاوەنی لەباری رەها لە بەرهەمهێنانی رستن و چنین دا واتە تێچوونی رستن و چنین لە هیندستان بەرزترە بە بەراوردکردن لەگەڵ ئینگلترادا.

٢- بیردۆزی تێچوونە رێژەییەکان (لەباری رێژەیی)

The Theory Of Comparative Costs

دیڤید ریکاردۆ ئەم بیردۆزەی بەهۆی کاریگەری بارودۆخە ئابووری و رامیارییەکانی ئینگلتەرای سەدەی نۆزدەهەم دارشتووە و ریکاردۆ بیردۆزەکەی لەسەر چەند گریمانێك بونیادناوە کە ئەمانەن:

أ- بوونی باری کێبڕکێی تەواوەتی.

ب - خستنەگەری تەواوەتی لە هەردوو دەوڵەتەکەدا هەبێت.

ج - بەربەستی گومرگی لەنێوان دوو دەوڵەتەکەدا نەبێت.

د- تێچوونی گواستنەوە لەنێوانیان نەبێت و ئاڵوگۆڕکردن بەسەوداگەری (شمەك بە شمەك) بێت،

هـ- تەنها دوو دەوڵەت و دوو شمەك هەبێ.

ریکاردۆ بیردۆزەکەی لەڕێگەی ئەم نموونەیەوە ڕوونی کردەوە تێچوونی بەرهەمهێنان لەسەر بنەمای یەکەکانی کار دەبێت:

| دەوڵەت | گەنم | لۆکە |
|---|---|---|
| عێراق | ٨ | ٩ |
| میسر | ١٢ | ١٠ |

لەم نموونەیەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دیار دەکەوێ کە عێراق لە بەرهەمهێنانی هەردوو شمەکەکەدا لە بارێکی ڕەهای هەیە، بەڵام میسر لە بەرهەمهێنان لە هیچ یەکێك لەو شمەکاندا باری ڕەهای نییە، بەڵام ئەگەر تێچوونی بەرهەمهێنانی دوو شمەکەکە بە یەکتری بەراوورد بکەین لەیەك وڵاتداو لەپاشاندا تێچوونی هەر شمەکە بەجیا لەنێوان هەردوو وڵاتەکەدا بەراوورد بکەین، دەبینین کە تێچوونی بەرهەمهێنانی گەنم لەعێراق تا ڕادەیەك کەمترە لەتێچوونەکەی لە میسر و تێچوونی ڕێژەیی لۆکە لە میسر تا ڕادەیەك کەمترە لە تێچوونەکەی لە عێراق و بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- لەمیسر: بەرهەمهێنانی تەنێك گەنم پێویستی بە (١٢ یەکەی کارە)، بەڵام بەرهەمهێنانی تەنێك لۆکە پێویستی بە (١٠ یەکەی کارە).

$$\text{تێچوونی ڕێژەیی بۆ لۆکە} = \frac{١٢}{١٠} = ١,٢٠ \text{ یەکەی لۆکە.}$$

$$\text{بەڵام تێچوونی ڕێژەیی بۆ گەنم} = \frac{١٠}{١٢} = ٠,٨٣ \text{ یەکەی گەنم}$$

واتە تا ڕادەیەك لۆکە هەرزانترە لە گەنم لە میسر.

٢- لەعێراق: بەرهەمهێنانی تەنێك گەنم پێویستی بە (٨ یەکەی کارە) و بەرهەمهێنانی تەنێك لۆکەش پێویستی بە (٩ یەکەی کارە).

$$\text{تێچوونی ڕێژەیی بۆ گەنم} = \frac{٩}{٨} = ١,١٢ \text{ یەکەی لۆکە.}$$

$$\text{بەلام تێچوونی ڕێژەیی لۆکە} = \frac{٨}{٩} = ,٨٨ \text{ یەکەی گەنم}$$

واتە گەنم لە عێراق تا رادەیەك هەرزانترە لە لۆکە .

هـەر بۆیـە میسـر لەبەرهـەمهێنانی لۆکـە پسـپۆر دەبێـت و عێـراقیش لەبەرهەمهێنانی گەنم دا پسپۆر دەبێت و لەپاشاندا ئاڵوگۆڕ لەنێوانیاندا دێتـە کایەوە.

ئەگەر وا دابنێین کە تێکڕای ئاڵوگۆڕ لە نێوانیاندا ١ گەنم = ١ لۆکە.

ئەوا میسر (١٧٪) یەکە گەنم قـازانج دەکـات بـۆ هـەر یەکەیـەك لـە لۆکـە کـە بەرهەمی دێـنێ و بـۆ عێراقـی دەنێـرێ، عێـراقیش (١٢٪) یەکـە لۆکـە قـازانج دەکات لە بەرهەمهێنان و ناردنە دەرەوەی هەر یەکە گەنمێك بۆ میسر.

بەمشێوەیە بەرژەوەندییەکی هاوبـەش (قـازانج) لـە پسـپۆربوون و ئـاڵوگۆڕی نێودەوڵـەتی دێتـە کایـەوە لـەکاتی ناچـۆنییەکی تێچـوونە ڕێژەییـەکان هـەر چـەندە ئەگـەر هـیچ یـەکێکیان لـە بارییـەکی بـێ هاوتاشـیان نـەبێت لـە بەرهەمهێنانی شمەکێکی دیاری کراودا.

**بازاڕی دراو گۆڕینەوەی بیانی :** Foreign Exchange Market

**(ئەو بازاڕەیە کە کەسەکان و دەزگاکان و بانکەکان کرداری کڕین و فرۆشتنی دراوی بیانی تیا دەکەن، بەمانایەکی تر بازاڕی دراو گۆڕینەوە پێناسە دەکرێت بەوەی کە سەرجەمی خواست و خستنە رووی دراوە بیانییەکانە).**

**ئەرکە سەرەکییەکانی بازاڕی دراو گۆڕینەوە:**

أ- گۆڕینەوەی یەکێك لە دراوە نیشتمانییەکان بە دراوێکی دیکە: هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خواست هەیە لەسەر دراوەکەی دووەم (بیانییەکە) کە لەوەوە دروست دەبێت کە ئەو دراوە پێویستە جا سەرچاوەی خواستەکە بۆ گەشتوگوزار یان بازرگانی یان بۆ وەبەرهێنان یان بۆ چارەسەری نەخۆشی و مەبەستەکانی دیکە وەك گێڕانەوەی سووەکانی قەرز بێت.

ب – دڵنیاکردن: ئەرکی دڵنیاکردنەوە بە کارێکی گرنگی بازاڕی دراو گۆڕینەوەی بیانی دادەنرێت، چونکە ماوەیەك هەیە لە نێوان ناردنی شمەکێك لەلایەن دەوڵەتێکەوەو هێنانی لەلایەن دەوڵەتێکی ترەوە، ئەم ماوەیەش بە ماوەی گەیشتن ناسراوە و ئەو ماوەیەش پێویستی بە دڵنیاکردنەوە (پارەدارکردن) هەیە و ئەمەش ئەو ئەرکەیە کە بازاڕی دراو گۆڕینەوەی دراوی بیانی ئەنجامی دەدات.

هەروەها ماوەیەکی دیکە مامەڵە دەرەکییەکان هەیە کە بریتییە لەو ماوەی کە کڕیار پێویستی پێیەتی بۆ دووبارە فرۆشتنەوەی شمەکەکانی لەپێناوی ئەوەی بتوانێ بیدات، پێویستیی بە پارەدارکردن هەیە واتە پێویستی بە

دڵنیاکردنـەوە هەیـە، هـەردەم نێـرەران(مصـدرون) مـاوەی سـێ مـانگ بـە هاوردەکاران دەدەن بۆ دانەوەی ئەو برە پارەیەی لە ئەستۆیانە.

ج – کرداری هاوسەنگ کردن: مەبەست لە کرداری هاوسەنگ کردن لە بـازاڕی دراو گۆڕینەوەدا کڕینی دراوەکانە لەو بازاڕەی کە نرخی دراوەکان تارادەیەك نزمە و فرۆشتنەوەی لە بازاڕەکانی تردا کە تارادەیەك نرخەکان تیایدا بەرزتر بێـت، ئـەم کردارانـەش بـە هەمیشـەیی ڕوو دەدات، چـونکە لەلایـەك گـۆڕانی ڕێژەیی هەیە لە نرخی بازاڕە نێودەوڵەتییەکانـدا و، لەلایـەکی تـریش بـەهۆی بوونی جامبازەکان لە بازاڕدا.

**نرخـی دراو گـۆڕینـەوە: (Exchange rate)**

(بریتییە لە چەند دانەیەك لە دراوی نیشتمانی لەبەرامبەر نرخی یەك یەکە لە دراوێکی بیانی دەدرێـت) بـۆ نموونـە کاتێـك نرخـی دراو گۆڕینـەوە لـە نێـوان دۆلارو دیناردا دیاری بکەین دەکاتە ژمارەی ئەو دینارانـەی کـە پێویسـتن بـۆ کڕینی دۆلارێکی ئەمەریکی، ئەمەش مانای ئەوەیـە کـەکاتێك ١ دۆلار = ١٢٠٠ دینار ئەوا پێویستمان بە پێدانی ١٢٠٠ دینارە تا دۆلارێك بە دەست بهێنین.

**دیاریکردنی نرخی دراو گۆڕینەوە:**

**١- نرخی دراو گۆڕینەوەی جێگیر**

ڕێسای زێڕ تاساڵی ١٩١٤ جێبەجێ دەکرا و بەپێی ئەم ڕێسایە هەر دەوڵەتێك ناوەرۆکی زێڕ بۆ دراوەکەی دیاری دەکات و ئامادەیە بۆ کڕین و فرۆشتنی هەر برە زێڕێك بەو نرخە، تاکو ئەو ناوەرۆکە زێڕە بۆ هەر دراوێك جێگیر بێت ئەوا نرخی درلو گۆڕینەوەکەشی جێگیر دەبێت.

بۆ نموونە ئەگەر ناوەڕۆکی زێڕینی بۆ دینارێکی عێراقی = ٢/٥٠ گرام لە زێڕو ناوەرۆکی زێڕین بۆ دۆلارێکی ئەمەریکی = ٥ گرام لە زێڕ ئەوە مانای وایە نرخی دراو گۆڕینەوە لە نێوانیان دا دەکاتە دابەشکردنی ناوەرۆکی زێڕین بۆ یەکێك لە دراوەکان لە سەر ناوەرۆکی زێڕین بۆ دراوەکەی تر.

$$\text{ئەوا نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بە دینار} = \frac{\text{٥ گم}}{\text{٢/٥٠ گم}} \text{ ٢ دینار}$$

$$\text{ئەوا نرخی گۆڕینەوەی دینار بە دۆلار} = \frac{\text{٢/٥٠ گم}}{\text{٥ گم}} = \frac{١}{٢} \text{ دۆلار}$$

ئەمەش مانای ئەوەیە کەئەو برە زێڕەی لە ئەمەریکا دەتوانین بەدۆلارێك بیکڕین لە عێراق بەدوو دینار، بیفرۆشینەوە ئەو زێڕەی لەعێراق بەیەك دیناردەکڕدرێت لە ئەمەریکا دەفرۆشرێتەوە بە نیو دۆلار، ئەمەش مانای ئەوەیەکە دیناری عێراقی نرخەکەی کەمترە لە دۆلاری ئەمەریکی، چونکە ناوەرۆکە زێڕەکەی کەمترە لە ناوەرۆکە زێڕەکەی دۆلار.

بۆ جێبەجێکردنی سیستەمی نرخە جێگیرەکان (زێڕ) پێویستە سێ مەرجی سەرەکی هەبێت کە ئەمانەن:

١- دیاریکردنی بەهایەکی جێگیر بۆ دراوی نیشتمانی بە زێڕ.

٢- سەربەستی هێنان و ناردنی زێڕ .

٣- دڵنیابوون لە گۆڕینەوەی دراوە نیشتمانییەکە بە زێڕ و بەپێچەوانەوە بەبێ کۆت بەگوێرەی تێکرای جێگیری کێشی یەکەی دراوەکە بۆ زێڕەکە.

٢- نرخی دراو گۆڕینەوەی گۆڕاو (نەرم):

نرخی دراو گۆڕینەوە لە یاسای ڕێسای زێڕدا (نرخی گۆڕینەوەی جێگیر)، ڕێسای نرخی دراو گۆڕینەوە لەم ڕێسایەدا پشت دەبەستێت بە وازهێنان لەنرخی دراو گۆڕینەوە تا بە پێی هێزەکانی خواست و خستنە ڕوو دیاری بکرێت، بەمەش دەزگای نرخ کە خۆی لە هێزەکانی خواست و خستنە ڕوودا دەبینێتەوە، نرخی درلو گۆڕینەوە دیاری دەکرێت بەرامبەر بە دراوەکانی تر بەبێ هیچ دەست تێوەردانێکی دەسەڵاتە نەختینەییەکان لە دەوڵەتدا.

لە هێڵکاری ژمارە ( ٢) دەتوانین ئەو چۆنیەتییە دیاری بکەین کە نرخی هاوسەنگی پێ دیاری دەکرێت **(نرخی هاوسەنگی ئەو نرخەیە کە کڕیارو فرۆشیار لە هەمان کاتدا ئامادەن ئەو دراوەی پێ بکڕن یان بفرۆشن)**



وێنەی ژمارە (٣) دیاریکردنی نرخی دراوگۆڕینەوە

هێڵە ستوونییەکە نرخی گۆڕینـەوەی یـۆرۆ بـە دۆلار بـەدیار دەخـات و هێڵـە ئاسۆییەکەش بڕی خواست و خستنەڕووی یۆرۆیە.
دیاری نرخی گۆڕینـەوە یـۆرۆ لـە خـاڵی (أ) دا نیشـانە دەکرێـت کـە بـەنرخی هاوسەنگی ناو دەبرێت **(واتە یەکسانبوونی خواست و خستنەڕوو بەیەکەوە لەسەر ئەو دراوە)**. جـا ئەگـەر نرخـی دراو گۆڕینەوەکـە لـە (٤ دۆلارەوە) بـۆ (٦ دۆلار) بەرز بێتەوە، ئەمەش دەبێتە هـۆی زیـادبوونی بـڕی خسـتنە ڕوو و کەمبوونەوەی بڕی داواکراو (خواست)، لەبەر ئەوەی خستنەڕووی گـەورەترە (زۆرترە) لە خواست لەسەر یۆرۆ، ئەمەش جارێکی تر دەبێتە هۆی دابـەزینی نرخی گۆڕینەوەکەی تا دەگاتەوە بە نرخی هاوسەنگی (٤).
بەڵام ئەگەر نرخی دراو گۆڕینەوەکە دابەزێت و ببێتـە (٢دۆلار) ئـەوە دەبێتـە هۆی بەرزبوونەوەی بڕی داواکراو و کەمبوونـەوەی بـڕی خسـتنەڕوو، چونکە قەبارەی داواکراو زیاترە لە قەبارەی بـڕی وەبـازاڕ خـراو یـۆر، ئـەوە دەبێتـە

هـۆی بەرزبوونـەوەی نرخـی دراو گۆڕینـەوە و جـارێکی تـر بـەرەو نرخـی هاوسەنگییەکە (٤) دەڕوات.

بـەکارهێنانی زاراوەی (**تـەعویم** floating) لەسـەرەتای حـەفتاکان سـەدەی بیستەم بڵاوبۆوە کە مەبەست لێی( **دیـاریکردنی نرخـی دراوە لـە بـازاڕدا بـە پێی هێزەکانی خستنە ڕوو و خواسـت بـێ هـیچ دەسـتتێوەردانی دەسـەڵاتە نەختینەییەکان) ئەمەش پێی دەوترێت** (تەعویمی پـاك)، بـەڵام مەبەسـت لـە (تەعویمی ناپاك) ئەوەیە **(ئەگەر دەسەڵاتە نەختینەییەکان دەست وەریدەنە ناو بازاڕەکانی گۆڕینەوەوە وەك کڕیار یـان فرۆشـیار بەمەبەسـتی کارکردنـە سەر بەهای دراوەکە بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو).**

دەوڵەتیش وەك فرۆشیاری دراوە نیشتمانییەکەی دەسـت وەردەداتـە بـازاڕ بەمەبەستی خستنەڕووی پارە زیاتر، پاشان تا دابەزاندنی بەهاکەی لە پێنـاو دابەزاندنی نرخی نێراوەکـان و بـۆ زیـادکردنی خواسـتی جیهـانی لەسـەریان، یاخود وەك کڕیاری دراوەکەی دەست بە ئامانجی کەمکردنەوەی خستنەڕووی و دواتر بەرزکردنەوەی بەهاکەی تا ڕێگە بگرێت لە چوونە دەرەوەی سەرمایە بۆ دەرەوە.

٣. سیستەمی چاودێری کردنی گۆڕینەوەی دراو:

ئـەم سیسـتەمە بـە شـێوەیەکی بـەرفراوان دەرکـەوت کـە پێشـتر جیهـان بـەخۆوەی نـەدیبوو ئەمـەش پـاش قەیرانـە ئابوورییـە گەورەکـەی جیهـان لەماوەی ١٩٢٩-١٩٣٣ کاتێك کارکردن بەم سیستەمە بڵاوبۆوە لـە ئـەڵمانیاو وڵاتانی دیکەی ئەورووپای ناوەڕاست و ڕۆژهەڵات و ئەمەریکای لاتینی.

ئەم قەیرانە بووە هۆی هەرەسهێنانی ڕێسای زێـڕی جیهانی بـەخۆوە بینـی لەبەر ئەم هۆکارانە:

أ- ئەم قەیرانە ئابوورییە گەورەیـە بـووە هـۆی دروسـتبوونی کەمبوونـەوەی قەبارەی بازرگانی دەرەکی، کە ئەمەش بووە هۆی کورت هێنـانێکی گـەورەو بەردەوامی تەرازووی پارەدانی ئەو وڵاتانە.

ب - ئـەم قەیرانـە ئابوورییـە کـاری کـردە سـەر ئـابووری گـەورەترین دوو دەوڵەتی قەرزدەر لەو کاتەدا کە ئەوانیش (وڵاتە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکاو بـەریتانیا) بـوون، ئـەنجامی ئەمـەش لێشـاوی ناردنـە دەرەوەی سـەرمایەی درێژخایـەن لـەم دوو دەوڵەتـەوە بـۆ ئـەو دەوڵەتانـەی کـە تـەرازووی پارەدانەکانیان تووشی کورتهێنان هاتبوو کەمی کرد.

ج - چـوونە دەرەوەی سـەرمایە لـە زۆریـەی دەوڵەتەکانـدا بـەهۆی جـێگیر نەبوونی بـارودۆخی سیاسـی (ڕامیـاری) و ئـابووری بـە ئامـانجی دۆزینـەوەی بازاڕی دیکەی نەختینەیی کە زیاتر جێگیرو دڵنیایی تیا بێت.

**پێناسەی( سیستەمی چاودێری گۆڕینـەوەی دراو ) دەکرێت بەوەی کـە (بریتییە لە سەرپەرشتیکردنی ڕێکو پێکی میری بۆ بازاڕی دراو گۆڕینـەوەی بیـانی وڵاتـە لەسـەر خواسـت و خسـتنە ڕووی گۆڕینـەوەی بیـانی لەڕێگـەی**

**ڕێگریکردن لە گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بۆ دراوەکانی تر بە سەریەستی بکرێت و تەنها لە سایەی ئەو ڕێسا ڕێکخراوانەوە بێت کە دەوڵەت دایناون).**

**ئامانجەکانی سیستەمی چاودێری گۆڕینەوەی بیانی:**

**أ- پارێزگاریکردن لە بەهای دەرەکی، دراوەکە بە بەرزتر لە بەها ڕاستەقینەکەی خۆی.**

**ب - پاراستنی پیشەسازییە نیشتمانییەکان لە کێبڕکێی بیانی چ لە ڕێگەی نەدانی مۆڵەتی گۆڕینەوە بێت یان لە ڕێگەی سەپاندنی نرخێکی بەرز بەسەر بۆ ئەو دراوە بیانیەی کە دەیانەوێت بە دەستی بهێنن.**

**ج- پشتگیریکردنی پلانەکانی پەرەپێدانی ئابووری بۆ دەوڵەت لە ڕێگەی بەخشینی مامەڵەیەکی لە بارتر بۆ هێنراوە سەرەکی یەکان (بنەڕەتییەکان) کە لە خزمەتی پرۆژەکانی پەرەپێدانی ئابوورییەکە دایەو لە سەر حسابی هێنانی شمەکە ڕواڵەتییەکان یان ناسەرەکییەکان.**

**ڕامیاری بازرگای دەرەکی (نێودەوڵەتی)**

**پێناسەکەی:** (بریتییە لە کۆمەڵێك ئامراز و کارڕاپەراندن کە دەوڵەت پەنایان بۆ دەبات لە بازرگانیکردنی لەگەڵ دەوڵەتەکانی تر، ئەمەش بە مەبەستی بە دەستهێنانی ئامانجی ئابووری دیاری کراو)، **ئەم ئامانجانەش بەپێی جیاوازی پلەی پەرەپێدانی ئابووری جیاواز دەبێت بۆ نموونە لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا ئامانجەکە بە دەستهێنانی خستنەگەڕی تەواوەتییە لە کاتێکدا ئامانج لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان دا بە دەستهێنانی**

پەرەپێدانی ئابوورییە لە رێگەی بەکارهێنانی رامیاری بازرگانیـەوە، رامیـاری بازرگانیش بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش دەکرێت کە ئەمانەن:

**یەکەم: رامیاری بازرگانی سەربەست:**

مەبەست لە رامیاری بازرگانی سەربەسـت (ئـەو دۆخەیـە کـە دەولـەت دەست ناخاتە نـاو پەیوەندییـە بازرگانییـە دەرەکییـەکان، بـە مانایـەکی تـر کردارەکـانی ئـالوگۆڕی نێودەولـەتی ئـەنجام دەدرێـت بـە سەربەسـتی بـەبێ بوونی هیچ کۆتێك).

**بەلگە سەرەکییەکانی رامیاری بازرگانی سەربەست:**

١- زیادبوونی داهاتەکان لە ئەنجامی پسپۆربوونی نێودەولەتی: چونکە ئـەم رامیارییە دەبێتە هۆی سەربەستکردنی بازرگانی لە نێوان دەولەتەکاندلو هـەر دەولەتەش پسپۆردەبێت لـەو لقـی بەرهەمهێنانـە دا کـە لەبارییـەکی رێـژەیی هـەبێت و جیـای بکاتـەوە لـە دەولەتـەکانی تـر، بنـەماکانی بەرهـەمهێنان ئاراستەی ئەو لقە دەکرێت کە توانای بەرهەمداری تیایدا بـەرزە ئـەو لقانـەش بـەجێ دەهێلێـت کـە بەرهەمـداری تیایـدا نزمـە، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی بەرزبونەوەی پاداشت و داهاتەکانی بنەماکانی بەرهەمهێنان.

٢- لە سایەی سەربەستی بازرگانی دا دەرکەوتن و بلاوبوونەوەی دامەزراوەو دەزگای قۆرخکاری قورسە، ئەمەش لە بەرئەوەیە کە قۆرخکاری نێودەولەتی و هەرێمی تەنها لە سایەی رامیاری پاراستن دا دادەمەزرێت.

٣- رامیـاری پاراسـتن (بـەکارهێنانی رەسـم -بەشـکاری - مـاف پێـدان) پێویستی بە یاسا دارشتنی زۆر هەیە، ئەمەش چـەندین شـوێنەوارو ئـەنجامی جۆراو جۆری ئـابووری لـێ دەکەوێتـەوە، چـونکە پێویسـتی بـە ئیدارەیـەکی عاقلانە و تەرخانکردنی زۆر گەورەو کەسانی پسپۆر هەیە .

٤- سەریەستی بازرگانی یارمەتی گواستنەوەی بنەماکانی بەرهەمهێنان دەدات لە نێوان دەوڵەتەکاندا بەتایبەتی گواستنەوەی دەستی کارو سەرمایە.

٥- لایەنگرانی سەریەستی باس لەوە دەکەن کە رەسمی گومرگی چەندین کەم و کورتی و شوێنەواری ئابووری هەیە، دەبێتە هۆی لەدەستدانی متمانەی خاوەن کارەکان و بازرگانەکان لە بارودۆخە ئابوورییەکان و هەروەها بەکاربەر ناچار دەکات کە رەسم (باج) ی ناپێویست بدات، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی خەرجییەکانی بژێوی و ئەمانەش هەموویان دەبنە هۆی کەمبوونەوەیەکی بەرچاو لە بازرگانی دەرەکیدا.

دووەم : ڕامیاری پاراستنی بازرگانی:

مەبەست لە ڕامیاری پاراستن (ئەو بارەیە کە دەوڵەت دەسەڵاتی گشتی خۆی بەکاربهێنێت تا کاری پێ بکاتە سەر قەبارەی ئاڵوگۆڕکردنە نێودەوڵەتییەکان یان ئاراستەکانیان یان بەرهەمە ناوخۆییەکان بپارێزێت لە بەربەرەکانی شمەکە بیانییەکان).

بەڵگەکانی لایەنگرانی ڕامیاری پاراستن :

لایەنگرانی ڕامیاری پاراستن پشت دەبەستن بەم بەڵگانەی خوارەوە وەك بەڵگەیەك بۆ بۆچوونەکانیان کە پێویستە دەوڵەت دەست بخاتە ناو ڕێکخستنی بازرگانی دەرەکی لەوانەش:

١- پاراستنی پیشەسازییە تازە دامەزراوەکان : ئابووریناسی ئەڵمانی (فردریك لیست) لە کتێبەکەی (ڕژێمی نەتەوەیی بۆ ئابووری ڕامیاری) کە لە ساڵی ١٨٤١ بڵاوکراوەتەوە داوای پاراستنی پیشەسازییە تازە دامەزراوەکان دەکات.

٢- خاوەن كارو ڕێكخەرەكان داوای ئەوە دەكەن كە پێویستە یارمەتی پیشەسازییە نیشتمانییەكان بدرێت و بپارێزرێت، چونكە ئەوە یارمەتی مانەوەی پارە دەدات لە ناوخۆی وڵاتدا، لەبەر ئەوەی پیشەسازییە ناوخۆییەكە یارمەتی دەوڵەت دەدەن كە شمەك لە ناوخۆدا پەیدا بكات لەجیاتی خەرجكردنی لە پێناو لە دەرەوە هێنانیان.

٣- پاراستنی ئاسایشی دەوڵەت: چونكە یارمەتی دەوڵەت دەدات كە ئەو شمەكە بنەرەتییانە بەرهەم بهێنێت كە ناتوانرێت لە كاتەكانی شەڕو گەمارۆدانی ئابووری بەدەست بهێنرێت، دەتوانین بڵێین كە كۆمەڵێك لەبەر چاو گرتن هەیە كە پەیوەندیان بەبەرگری نیشتمانییەوە بۆتە هۆی دەركەوتنی پاراستن.

٤- لایەنگرانی پاراستن دەڵێن سەپاندنی ڕەسمی گومرگی پێویستە، بۆ ئەوەی قەرەبووی (تعويض)بەرهەمهێنی ناوخۆی پێ بدرێتەوە لەو جیاوازییەی كەلە نێوان خەرجییەكانی بەرهەمهێنانی ناوخۆ و دەرەوەدا هەیە.

٥- پاراستن دەبێتەهۆی فرلوانكردنی پیشەسازییە ناوخۆییەكان و زیادبوونی خستنە سەر كاری كرێكار تیایاندا، چونكە ئەگەر ڕەسمی گومرگی بەرز لەلایەن دەوڵەتەوە بخرێتە سەر شمەكێكی دیاریكراو ئەوە ئەمە دەبێتەهۆی زیادبوونی خواستی پیشەسازییەكان لە سەر دەستی كرێكار، ئەمەش بەپێی دەوری خۆی دەبێتە هۆكاری چارەسەرو كەمكردنەوەی قەبارەی بێكاری لە وڵاتدا .

**ئامرازەکانی ڕامیاری بازرگانی:**

أ- ڕەسمی گومرگی (باجی گومرگی) Tariffs:

**ئەو ڕەسمەیە کە دەخرێتە سەر شمەکە بازرگانیەکان (هێنراو-نێراو) کە بەسنووری نێودەوڵەتی وڵاتێکدا تێپەڕ ببێت.**

**مەبەستەکانی ڕەسمی گومرگی:**

**١- لەوانەیە ئەم ڕەسمانە بە مەبەستی بە دەستهێنانی داهات بێت بۆ خەزینەی گشتی دەوڵەت.**

**٢- هەروەها باج (ڕەسم) دەسەپێنرێت بە مەبەستی پاراستن واتە پاراستنی شمەکە ناوخۆییەکان لە بەربەرەکانی شمەکە بیانییەکان.**

**٣- هەروەها ڕەسمی گومرگی بە مەبەستی ئابووری دەسەپێنرێت وەك ئەوەی بسەپێنرێتە سەر نێراوەکان بە مەبەستی کەمکردنەوەی چوونە دەرەوەی ئەو شمەکە وەك شمەکی خواردەمەنی.**

**جۆرەکانی باجی گومرگی:**

**باجی گومرگی لە ڕووی کارگێڕییەوە دابەش دەکرێت بۆ:**

**١- باج بە پێی بەها: ئەو باجەیە کە بە ڕێژەیەکی سەدی دیاریکراو لە بەهای شمەکەکە بڕیاری لەسەر دەدرێت وەك ئەوەی ١٠٪ لە بەهای جل و بەرگ بێت و لەوانەشە ئەو ڕێژەیە لە شمەکێکەوە بۆ شمەکێکی تر بگۆڕێت .**

**٢- باج بە پێی جۆر: بریتییە لە بڕێك پارەی نەگۆڕ / جێگیر کە دەخرێتە سەر یەکەیەکی ئەو شمەکە وەك ئەوەی بڕی باجەکە (٥ دۆلار) بێت بۆ هەر مەترە قوماشێکی هێنراو، ئەم باجەش بە پێی جۆری شمەکەکەو کوالیتەکەی دەگۆڕێت.**

**٣- باجی بەناو:** ئەو باجەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نرخی بە نیمچە جێگیر بمێنێتەوە، چونکە ئەگەر نرخی شمەکەکان لە بازارەکانی دەرەوە دابەزێت، ئەوا بەهای باجەکە زیاد دەکەن، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر نرخەکانی لە دەرەوە زیاد بکات ئەوا باجەکە کەم دەکەنەوە.

ب- سیستەمی بەشکاری: بریتییە لە سیستەمێك کە دەوڵەت بە پێ ی ئەوە بڕی هێنراوەکانی دیاری دەکات لەو شمەکە دیاری کراوانەی کە دەشێت بیانهێنێتە ناوەوە لە ماوەیەکی دیاری کراودا، هەروەها مەبەستی سەپاندنی کۆتەکانە لەسەر هێنراوەکان، هەندێك جاریش لەسەر نێراوەکان دەبێت بە شێوەیەك کە دەوڵەت ئەو بڕە دیاری دەکات کە ڕێگەی پێدراوە بهێنرێت یان بنرێتە دەرەوە.

ج- سیستەمی مۆڵەتی هێنراوەکان : لەوانەیە دەوڵەت لە هێنراوەکاندا ملکەچی مۆڵەتی هێنرلو بێت و نەیەڵێت بازرگان شمەکێك لە دەرەوە بهێنێت تا لە پێشەوە ڕێگەپێدانی لەدەسەڵاتی گشتییەوە بۆ وەرنەگیرێت و ڕێگەی پێبدات هەڵسێت بەو کرداری هێنانە لەدەرەوە لەوانەیە ئەم سیستەمە بە مەبەستی بڕێکی دیاری کرلو بێت بێ ئەوەی بڵاوکردنەوەی بۆ بکرێت دەوڵەت بڕە هێنراوەکە دیاری دەکات لە ڕێگەی پێدانی مۆڵەتەکانی هێنان بە بازرگانەکان. لەوانەشە بەکاربهێنرێت بۆ پاراستنی بازارە نیشتمانییەکان لە هێنراوەکانی چەند دەوڵەتێك، ئەمەش بەوە دەبێت کە مۆڵەتەکانی ڕێپێدان ڕەت بکرێتەوە و یان مۆڵەتەکە نەدرێت بەو شمەکانەی کە ئارەزوویان لەسەر نییە.

د- كۆمەك كردن: كۆمەك كردن بە يەكێك لە ئامرازەكانی ڕامیاری بازرگانی دادەنرێت كە دەوڵەتەكان دەیگرنە بەر لە چوارچێوەی شێوازەكانی نرخدا لەوانەیە دەوڵەت بۆ پاراستنی بەرهەمە نیشتمانیەكانی پشت ببەستێت بە پێشكەشكردنی بەخشین و كۆمەك بۆ بەرهەمهێنەكان بەمەبەستی ئەوەی بتوانن شمەكەكانیان بەنرخێكی كەمتر لە تێچوونی بەرهەمهێنانیان بخەنە ڕوو، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخی ئەو شمەكانەی كە بۆ فرۆشتن ئامادە كراون تا بتوانرێت ئەو شمەكانەی لە ناوخۆدا بەرهەم هێنراون بەربەرەكانی شمەكە بیانییە هێنراوەكانیان پێ بكرێت.

**دوو جۆر لە كۆمەك كردن هەیە:**

**١- كۆمەك كردنی ڕاستەوخۆ:** ئەمەش خۆی لە بەخشینی بڕێك پارەدا دەبێتەوە جا لە سەر بنەمای بەها یان لە سەر بنەمای جۆر دیاری دەكرێت .

**٢- كۆمەك كردنی ناڕاستەوخۆ:** ئەمەش خوی چەند ماف پێدانێك بە پرۆژەكان دەبینێتەوە كە مەبەست لێی باشتركردنی باری داراییانە، لە نمونەكانی:

أ- لێ خۆش بوون (بەخشین) لە باجەكان: وەك بە دەركردن لە هەندێك باج یان كەمكردنەوەی تێكڕاكانی یان گێڕانەوەی بەشێك لەوانەی كە دراون یان بەخشینی بەشێك لە قازانجی باجەكان ئەگەر لە مەبەستی دیاری كرلو بەكاربهێنرێت وەك زیادكردنی بەرهەمداری پرۆژەكە .

ب- ئاسانكاری دڵنیاكردنەوە: جا ئەوانە بێت كە پەیوەندیان بە قەرزەكانەوە هەبێت یان دابەزاندنی نرخی سوووەكان و زیادكردنی قەبارەی قەرزدان و ئاسانكاری لە ماوەی دانەوەی .

ج- پێشکەشکردنی هەندێ کارگوزاری ئەوتۆ کە بەکەڵك گەیاندن بگەڕێتەوە بۆ پرۆژەکان وەك بەشداریکردنی لە بازاڕو پێشانگا نێو دەوڵەتییەکان و لە ئەستۆ گرتنی بەشێك لەو خەرجی یانەی کە پێویستە بۆ ئەو کارانە وەك خەرجییەکانی گواستنەوەی شمەکەکان و خەرجییەکانی نیشتەجێ بون و کرێی خانوبەرەو تێچوونەکانی هاتووچۆو پڕوپاگەندەکان .

**تەرازووی پارە دان** Balance of Payments

(تۆمارێکی ڕێکخراوە بۆ هەموو مامەڵە بازرگانی و دارایی و نەختینەییانەی کە لەنێوان دانیشتوانی وڵاتێکی دیاری کراو و دانیشتوانی وڵاتەکانی تردا ڕوو دەدات لە ماوەیەکی دیاری کراودا کە بەشێوەیەکی گشتی ساڵێکە جا ئەو دانیشتوانانە کەسەکان بن یان پرۆژەکان یان میری بێت) .

**گرنکی تەرازووی پارەدان:**

أ- پێشکەشکردنی زانیاری گرنگ سەبارەت بەو پلەیەی کە دەیبەستێتەوە بە ئابووری نەتەوەوە ئەگەر داتای تایبەت لەماوەی یەك بە دوایەکی دیاری کراومان لە بەردەست دابێت ئەوا وردەکاری زیاترمان دەست دەکەوێت سەبارەت بە پێش کەوتنی لەو ماوەیەو گۆڕانکاریە بنەڕەتییەکانی مامەڵە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان کە ئابووری نەتەوەی پێیا تێپەڕیوە.

ب- هاوکاری دانەرانی ڕامیاری ئابووری دەکات لە ئاراستەکردنی جڵەوی کاروباری دەوڵەت لەبەر ئەوەی لەزۆریەی کاتدا کارڕاپەڕاندنە دارایی و نەختینەییەکان بەستراونەتەوە بە باری (دۆخی) تەرازووی پارەدانی ئەو دەوڵەتەوە.

ج- ئـەو داتايانـەی (زانياريانـەی) لـە تـەرازووی پارەدانـەوە هـاتووە بـە ئامرازێکی هەڵسـەنگاندن و لێکدانـەوەی زانسـتی دادەنرێـت بـۆ زۆريـەی ئـەو دياردە ئابوورييانەی کە پەيوەنديان هەيە بە ئابووری جيهانييەوە .

## پەيکەربەندی تەرازووی پارەدان:

ئەگەر بمانەوێت تەرازووی پارەدان لەوە زياتر بێت کە تەنها مافـەکانی دەوڵەتيك لەسەر جيهانی دەرەکی نيشان بدات يان مافـەکانی جيهـان لەسـەر ئەو دەوڵەتە دياری بکـات و بکرێتـە ئـامرازێکی شـيکردنەوەی ئـابووری ئـەوا پێويستە بە شێوەيەك پۆلين بکرێت کـە بـەپێی چـوار حسـاب جيابکرێتـەوە، هەريەکێك لەم حسابانەش پسپۆرو تايبەتمەند دەبێت لە جۆرێکی دياری کراو لە مامەڵە نێودەوڵەتييەکان و حسابەکانيش ئەمانەن :

١- حسابی بەگەڕ. ٢- حسابی سەرمايە

٣- حسـابی رەوانـەکردنی(حەواڵـەکردنی) يـەك لايەنـە. ٤- حسـابی زێـڕی نەختينەيی.

ئەوا لە خوارەوە ناساندنێك بۆ هەريەك لەم حسابانە دەکەين .

١- **حسابی بەگەڕ**: لەم حسابەدا بەهای هەموو ئـەو شمـەك و کارگوزارييانـە تۆمار دەکرێـت کـە لـەنێوان ئـەو دەوڵەتـەو جيهـانی دەرەکـی دا ئاڵوگۆڕيـان پێکراوە پێك دێت لە:

أ- تـەرازووی بازرگانی: لەم حسابەدا بەهای بازرگانی بينـراو تۆمـار دەکرێـت واتە تەنها بازرگانی شمەکی هێنراوو نێراوە، ئەگەر نێرلوەکانی لەشمەك زياتر بێـت لـە هێنراوەکـانی لەشمـەك ئـەوا دەڵـێين زيـاديی (سـەرڕێژی) هەيـە لـە تەرازووی بازرگانيدا، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو واتە هێنراوەکانی شمەك

زیاتر بێت لە نێراوەکانی شمەك ئەوا دەڵێین کورت هێنانێك هەیە لە تەرازووی بازرگانیدا.

ب- تەرازووی بازرگانی نەبینراو: ئەم تەرازووەش لە نێراوو هێنراوی کارگوزاری نەبینراو پێك دێت .

٢- حسابی سەرمایە: لەم حسابەدا هەموو ئەو مامەڵە نێودەوڵەتی یانە تۆمار دەکرێت کە پەیوەندیان هەیە بە موڵکایەتی و قەرزەکانەوە و پێك دێت لە (پشك و قەباڵەو دراو و بە بانك سپاردەکان و حەواڵەکان و قەرزەکان و قیستەکان و گێڕانەوەیان) . وە پێویستە جیاکردنەوەیەك بکەین لە نێوان مامەڵە درێژ خایەن و مامەڵە کورتخایەنەکان دا . مەبەستمان لە **(مامەڵەی درێژ خایەن)** ئەو لێشاوی سەرمایانەیە کە لە وڵاتەوە دەچنە دەرەوە یان بە پێچەوانەوە یەو ماوەکەی لە ساڵ زیاتر درێژە دەکێشێت و وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆ قەرزی درێژخایەن و قیستەکانی گێڕانەوەیان دەگرێتەوە.

بەڵام **(مامەڵەی سەرمایەی کورتخایەن)** کە بەمەبەستی ڕاست کردنەوەی (پاکۆکردنی) کورتهێنان یان سەرڕێژی لە تەرازووی پارەدان دا دەکرێت هەموو ئەو لایەنانەی تیا تۆماردەکرێت کە پێویستە لەکەمتر لە ساڵێك بدرێتەوە یان لەوانەیە ماوە کورت هۆکارێکی ڕامیاری یا گۆڕانی کۆمەلایەتی بە دولوە بێت یاخود بۆ هاندانی (مضاربة) (جامبازی دارایی) بێت بە سود وەرگرتن لە جیاوازییە تایبەتییەکانی نێوان نرخی دراوەکان.

٣- حسابی ڕەوانەکراوی(حەواڵەکاری) یەك لایەنە: بریتییە لە هەموو حەواڵەکردنانەی لایەنێك دەیکات جا دارایی بێت یان لە شێوەی شمەك بێت کەلە نێوان دەوڵەتەکان و کەسەکان دا دروست دەبێت، بیٚ ئەوەی هیچ پارە

پێدانێك لەسەر لایەنی دووەم دروست بکات (پەیدا بکات) وەك دیاری– قەرەبوو – بەخشین.

٤- **حسابی زێڕی نەختینەیی:** پێویستە جیاوازی بکەین لەنێوان ئەو زێڕەی کەکەسەکان و کۆمپانیاکان و دەوڵەتە بەرهەمهێنەکان هەیانە وەك شمەك مامەڵەی کڕین و فرۆشتنیان پێ دەکرێت و پێی دەوترێ (زێڕی نا نەختینەیی) وەك هەر شمەکێکی ئاسایی هێنراو و نێردراو لە تەرازووی بازرگانیدا تۆمار دەکرێت.

(حسابی زێڕی نەختینەیی) لە زێڕی نەختینەیی و یەدەگی دراوە بیانییەکان پێك دێت کە دەتوانرێت بگۆڕدرێنەوە.

وەزێڕ بایەخێکی تایبەتی هەیە لای زۆربەی دەوڵەتان، چونکە دانراوێکی نەختینەییە و هۆکارێکی پێدانی ئەوتۆیە کە قبوڵکردنێکی جیهانی لە سەرەو هەموو دەوڵەتێك دەتوانێت لەڕێگەی ناردنە دەرەوەی ئەو زێڕەوە هەر دراوێکی بیانی بوێت بە دەستی بهێنێت .

# هاوسەنگی و لاسەنگی لە تەرازووی پارەدان

هۆیەکانی لاسەنگ بونی تەرازووی پارەدان:

چەند هۆکارێك هەیە کە دەبێتە هۆی لاسەنگ بونی تەرازووی پارەدان لەوانەش:

١- شلەژانە ماوە کورتەکان: ئەم شلەژانانە کاتێك پەیدا دەبن کە بەروبومە کشتوکاڵییەکان توشی نەخۆشی ببن بە تایبەتیش ئەوانەی کە دەوڵەت لەناردنە دەرەوەدا پشتیان پێ دەبەستێت، ئەمەش دەبێتە هۆی لاسەنگ بون لە تەرازووی پارەدانەکەدا وەهەروەها ئەم لاسەنگییە لە کاتەکانی شەڕیشدا ڕوو دەدات کە کاتێك خواست لە سەر کەرەستە خاوەکان زیاد بکات و نێرلوی دەوڵەتە بەرهەمهێنەکانی زیاد بکات یان نێرلوی دەوڵەتە بەشداربووەکانی شەڕەکە کەم بکات .

٢- گۆڕانکاری لە داهاتی نەختینەیی: دەتوانین جیاوازی بکەین لە نێوان دوو جۆر گۆڕانکاریدا یەکێکیان ئەوەیە کە بەسەربەخۆ لە یەك دەوڵەتدا ڕوو بدات یان ئەوەی کە لە نێوان کۆمەڵێك دەوڵەتدا ڕوو بدات.

ئەگەر گۆڕانێکی سەربەخۆ لە داهاتی یەك دەوڵەتدا ڕووی دا (وەك ئەوەی دەوڵەتەکە لە دۆخی هەڵاوسان یان داکشانەوە بێت) بۆ نموونە ئەگەر هەڵاوسان تێیدا ڕووی دا ئەوە مانای ئەوەیە کە خواستی هەمووەکی لە سەر شمەك و کارگوزارییەکان زیاترە لە بەرهەمهێنانی هەمووەکی ناوخۆیی، دۆخێکی وەك ئەمەش دەبێتە هۆی کورتهێنان، چونکە خواستە زیادەکە بادەداتەوە سەر هێنراوەکان، بەڵام ئەو گۆڕانکارییانەی کەلە کۆمەڵێك دەوڵەتدا بەشێوەیەکی هاوبەش ڕوو دەدات ئەوا چالاکی ئابووری بەرز

دەكاتەوە یان نزم بكاتەوە لە كاتی بوونی پەیوەندی بازرگانی لەنێوان ئەو كۆمەڵە دەوڵەتەدا، ئەوا لەوانەیە گرفت لە تەرازووی پارەدانەكانیان دروست بكات ئەگەر بەكارهێنان و داهات لە یەكێك لەم دەوڵەتانەدا كەم بكات و بەتایبەتیش ئەگەر ئەو دەوڵەتە بایەخێكی گەورەی هەبێت لە ئابووری نێودەوڵەتییدا، ئەوا هێنراوەكانی كەم دەكات و بەشێك لە بەكاربردنی ناوخۆی ئاراستەی ناردنە دەرەوە دەكات، ئەمەش مانای ئەوەیە كە سەرریژییەك لە تەرازووی پارەدانەكەی دا بە دەست دێنێت، بەلام سەرریژیی بۆ ئەو دەوڵەتە بریتییە لەكورتهێنان بۆ ئەو دەوڵەتانەی كە هاوبەشیان لەگەڵ كرد لە بازرگانیی كردندا.

**٣- گۆڕانە پەیكەربەندییەكان:** گۆڕانی پەیكەریەندیی تەنها تایبەت دەبێت بەیەك كەرت لە ئابووری نەتەوەیی و لەوانەیە ئەوە لە لایەنی خواست یان لایەنی خستنە ڕوو ڕووبدات، چونكە لەوانەیە هەلومەرجەكانی خستنەڕوو بگۆڕێت كاتێك دەرامەتە سروشتییەكان بەرەو كەمبوونەوە بچن (بەهۆی بەكارهێنانی زۆرەوە) و تێچوونی پیشەسازی بەرز بێتەوە یان كاتێك داهێنراوێك بێتە كایەوە یان چاكتركردنی شێوازەكان و ڕێگەكانی بەرهەمهێنان هەبێت و ببێتەهۆی كەمكردنەوەی تێچوونەكان یان بەرهەم هێنراوی نوێ بخرێتە بازاڕەوە بۆ نموونە بەكارهێنانی ڕیشاڵی دەستكرد بە شێوەیەكی گەورە كاری كردەسەر بازاڕە، جیهانییەكانی ئاوریشم و خوری و لاستیكی دەستكرد، بێجگە لەو گۆڕانە پەیكەریەندییانەی لە پەیوەندییەكانی خواست وخستنەڕوو ڕوویان دا گۆڕانی پەیكەریەندیی تریش هەیە كەلە تێكرای لێشاوی سەرمایەی نێودەوڵەتی دا ڕوو دەدات، چونكە دۆزینەوەی دەرامەتی نوێ و گرنگ لە دەوڵەتێك وای لێ دەكات كە هێنانی سەرمایەی

بیانی کەم بکاتەوە یان هەر پێویستی پێی نەمێنێت، ئەمەش دەبێتەهۆی ئەوەی کە مەرکەزی (بنەڕەتی) ئەو دەوڵەتە بگۆڕێت لە دەوڵەتێکی قەرزدارەوە بۆ دەوڵەتێکی قەرزدەر بەهۆی وە بەرهێنانەکانی دەرەوەی یان بەهۆی کەم بوونەوەی بوونەکانی (اصول) لە دەرەوە کە سوودو قازانجی پێ دەگەیەنێت ولەم دۆخانەدا لاسەنگی پەیکەریەندیی لە تەرازووی پارەدان دا دەردەکەوێت جا بەهۆی لایەنی خستنەڕووەوە بێت یان خواستەوە بێت یان گۆڕان لە ئاستی بژێوی یان توانای دەوڵەتەکە بۆ قەرزکردن یان قەرزدانەوە بێت.

## شێوەکانی کورتهێنانی تەرازووی پارەدان:

کورتهێنانی تەرازووی پارەدان چەندین شێوەی هەیە کە گرنگترینیان بە کورتی ئەمانەن :

١- کەمیی بەرهەمهێنان لە بەروبوومێکی بنەڕەتیدا لەوانەیە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی قەوارەی نێرلوەکان.

٢- دۆزینەوەی کەرەستەی خاوی پیشەسازی لە دەرەوە دەبێتە هۆی دەست هەڵگرتنێکی هەموەکی یان بەشێك لەو خواستەی کە لەسەر کەرەستە خاوە سروشتییە نیشتمانییەکان هەیە لەلایەن بیانییەکانەوە.

٣- ڕوودانی بێ بازاڕی لە دەرەوە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خواست لە سەر بەرهەم هێنرلوەکانی ئابووری نیشتمانی.

٤- بەرزبوونەوەی ئاستی نرخەکان لە ناوخۆ بە پلەیەکی زیاتر لە بەرزبوونەوەکەی لە دەرەوە ڕێدەگرێت لە چالاکی ناردنە دەرەوە.

٥- جێبەجێکردنی بەرنامەکانی پەرەپێدان لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان هێنراویان لە ئامێرو کەرەستە هونەرییەکان لە دەرەوە زیاد دەکات.

٦- چوونە دەرەوەی سەرمایەی نیشتمانی لە ئەنجامی نەمانی متمانە لای خاوەن سەرمایەکان بەهۆی ترسیان لە خۆماڵیکردن یان دەست بەسەراگرتن یان شڵەژانی ڕامیارییەوە.

## چارەسەری لاسەنگی لەتەرازووی پارەداندا:

زۆربەی ئابووریناسەکان لە سەردەمێکی زووەوە هەوڵیان داوە کە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە:(ئایا هێزێکی خودی و لە خۆوە هەیە کە هاوسەنگی بۆ تەرازووی پارەدان بگێڕێتەوە؟) باسی چۆنیەتی گێڕانەوەی ئەو هاوسەنگییە بۆ تەرازووی پارەدانەکە دەکەن لە ڕێگەکانی:

١- هاوسەنگکردن لە ڕێگەی دەستێوەردانی دەوڵەتەوە.

٢- هاوسەنگکردن لە ڕێگەی میکانیزمی بازاڕەوە.

## ١- هاوسەنگکردن لە ڕێگەی دەستێوەردانی دەوڵەتەوە:

زۆربەی کات دەوڵەت بۆ گێڕانەوەی هاوسەنگبوون بە تایبەتی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا لە ڕێگەی کۆمەڵێك کار ڕاپەڕاندنەوە دەست دەخاتە ناو کاروبارەکان بە ئامانجی چارەسەرکردنی کورتهێنان و لەوانەش:

أ- دەوڵەت پشك و قەباڵە ناوخۆییەکانی بە بیانییەکان دەفرۆشێت، چونکە لە بەرامبەریدا دراوی بیانی دەست دەکەوێت و بۆ پارەدارکردنی کورتهێنان لە تەرازووی پێدانەکەی.

ب- فرۆشتنی ئەو پشك و قەباڵانەی کە دەوڵەت هەیەتی لە دەزگا بیانییەکان لە دەرەوە بە هاولاتیانی ئەو وڵاتە تا دراوی بیانی دەست بکەوێت.

ج- فرۆشتنی هەندێ زەوی و زاری ناوخۆ بە بیانییەکان لەپێناو بە دەستهێنانی دراوی بیانی دا.

د- فرۆشتنی بەشێك لە یەدەگی زێڕ بە دەرەوە.

هـ- لەوانەیە دەوڵەت لە دەزگا داراییە بیانییەکان وەك بانکی نێودەوڵەتی، یان سندوقی دراوی نێودەوڵەتی یان لەوڵاتە بیانییەکان قەرز وەربگرێت.

و- کەمکردنەوەی قەبارەی هێنراوە بینراو و نەبینراوەکان لە ڕێگەی جێبەجێکردنی ئامرازەکانی رامیارییە بازرگانییە جۆراو جۆرەکانەوە وەك سیستەمی بەشکاری یاخود سیستەمی گومرگی لە پێناو کەمکردنەوەی خەرجکردنەکان بە دراوی بیانی و لە هەمان کاتیشدا هانی نێراوە بینراوو نەبینراوەکانی دەدات بە ئامانجی گێڕانەوەی هاوسەنگی لە تەرازووی پارەدان دا.

## ٢-هاوسەنگکردن لە ڕێگەی میکانیزمی بازاڕەوە:

أ- هاوسەنگکردن بە ڕێگەی کلاسیکییەوە (میکانیزمی نرخەکان):

ئەم بیرۆکەیە بە شێوەیەکی سەرەکی لە بیرۆکەی کلاسیکییەکان (قوتابخانە کلاسیکییەکان) کلاسیکی نوێیەکاندا بڵاو بۆوە و، فەیلەسوفی ئینگلیزی (**داڤید هیۆم**) بە یەکەم کەس دادەنرێت کە بیردۆزێکی تایبەت بە هاوسەنگ کردنی هەر لەخۆوەی بۆ تەرازووی پارەدان دارشتووە، ئەمەش لە ڕێگەی کاریگەری گۆڕانەکانی ئاستی نرخی شمەکەکان و ئەم جۆری ڕاستکردنەوەیە سەردەمی ڕێسای دراوە زێڕینەکان دەگرێتەوە کە لە گرنگترین خاسیەتەکانی سەربەستی هێنان و ناردنی زێڕەو هاوسەنگبوونی تەرازووەکەش سێ مەرجی سەرەکی پێویستە:

١- جێگیری نرخی دراو گۆڕینەوە.

٢- پلەی کارپێدانی تەواوەتی بۆ بنەماکانی بەرهەمهێنان لە دەوڵەت دا.

٣- سەربەستی لە گۆڕانی نرخی شمەك و کارگوزارییەکان.

گریمان دەوڵەتێك هەیە ڕێسای زێڕ پەیڕەو دەکات و لە دۆخی کورتهێنان دایە، ئەمەش مانای ئەوەیە خواست بۆ دراوی بیانی گەورەترە لە بڕی خستنەڕووی و بەگەیشتن بە خاڵی چوونە دەرەوەی زێڕ، ئەوا ئەو دەوڵەتە هەڵدەستێت بە ناردنە دەرەوەی زێڕ بۆ دەرەوەو کەمبوونەوەی بڕی هەڵگیراویش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخی شمەك و کارگوزارییەکان لە ناوخۆدا بەپێی بیردۆزی بڕی پارە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە هۆکارێکی بزوێنەر دادەنرێت بۆ نێراوەکان و ڕاگرێکە بۆ هێنراوەکان و لە پاشاندا تەرازووی پارەدانەکە بەرەو هاوسەنگبوون دەچێت.

ب- هاوسەنگکردن لە ڕێگەی نرخی دراو گۆڕینەوە:

ئەم ڕاستکردنەوەی تەرازووی پارەدانە تایبەتە بە سیستەمی دراوە کاغەزییەکان کە لە ماوەی سالآنی ( ١٩١٤ - ١٩٤١) لەخۆوە دەگرێت، دەکرێت نرخی ئاڵوێرەکان بەشێوەیەکی مەزن لە بەشداری لە گێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ تەرازووی پارەدانەکە بکات، لە ڕێگەی هەموارکردنەوەی(تعدیل) نرخە ناوخۆیی و بیانییەکان بۆ شمەك و کارگوزارییەکان بەو شێوەیەی یارمەتی هاوسەنگبوون بدات لە نێوان هێنرلوەکان و نێرلوەکاندا.

گریمان دەوڵەتێك هەیە تووشی کورتهێنان بووە لە تەرازووی پارەدانەکەیدا، بۆیە ئەم دەوڵەتە بەهای دراوە نیشتمانییەکەی کەم دەکاتەوە بەرامبەر بە دراوە بیانییەکان ئەوا لەم حاڵەتەدا بەهای دراوە بیانییەکە بەرز دەبێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە نرخی شمەکە بیانییەکان گران بن لە چاو ناوخۆدا، بەمەش هێنرلوەکان کەم دەکات لە

دەرەوە، هـەروەها شمەکـە ناوخۆییـەکانیش هـەرزانتر دەبێـت لـە چـاو بیانییەکاندا، هەر بۆیە خواستیان لەسەر شمەکە نیشتمانییەکان زیاد دەکات و بەمەش نێراوەکانی دەوڵەت بۆ دەرەوە زیـاد دەکـات و هێنرلوەکـانیش لـە دەرەوە کەم دەکات و بـەم شـێوەیە هاوسـەنگی دەگەڕێتـەوە بـۆ تـەرازووی پارەدانەکە.

ج- هاوسەنگ کردن لە ڕێگەی داهاتەکانەوە (میکانیزمی نوێ):

ئەم ڕێگەیە بۆ هاوسەنگبوون پشت بە بیرۆزەی (کینز) دەبەستێت کـە لـە سـەرەتادا پێویسـتە نرخـی دراو گۆڕینـەوە، هـەروەها نرخـی شمەکـەکان و خستنەگەڕی تەواوەتی بۆ بنەماکانی بەرهەمهێنانیش جێگیر بێت، نـاوەڕۆکی ئـەم هاوسـەنگبوونەش بـەوە پوختـە دەکرێـت کـە لاسـەنگی لـە تـەرازووی پارەدان دەبێتە هۆی گۆڕان لـە ئاسـتی بەرهـەمهێنان و دەسـتی کـاردا، ولـە کـاتی کورتهێنانـدا ئاسـتی چـالاکی ئـابووری لـە نـاوخۆی وڵاتـدا بـەرەو نزمبوونەوە دەچێت، ئـەوەش لـە ئـەنجامی دابـەزینی خواسـت لـە سـەر ئـەو بەرهەمـە پیشەسـازییانەی کـە بـۆ ناردنـە دەرەوە ئامـادەکراون، هـەروەها دابەزینی خواست لە سەر نێراوەکان پاشان دەست دەکـات بـە کەمبوونـەوەو بەرتەسك بوونەوەیی کورتهێنانی تەرازووی پارەدانە کە دەچێت تا دەگاتەوە بە هاوسەنگبوون بۆ جاری دووەم.


هێڵكاری تەرازووی پـــارە دان
حسابی بەگەڕ
تەرازووی بازرگانیی
تەرازووی كارگوزاریی
نێراوی بینراو ( + )
نێراوی نەبینراو ( + )
هێنراوی بینراو ( --- )
هێنراوی نەبینراو ( --- )
حسابی سەرمایە
درێژ خایەن
كورت خایەن
لێشاوی لەدەرەوە بۆ ناوەوە ( + )
لێشاوی لەناوەوە بۆدەرەوە ( --- )
هاتوو بۆناوەوە ( + )
ڕۆیشتوو بۆدەرەوە ( -- )
حەواڵەكاری یەك لایەنە
حەواڵەكراو لە دەرەوە بۆ ناوەوە ( + )
حەواڵەكراو لە ناوەوە بۆ دەرەوە ( --- )
حسابی زێڕ
زێڕی نێراو ( + )
زێڕی هێنراو ( --- )
تێ بینی : نیشانەی ( + ) ئەوە نیشان دەدات كە دراوەكە لە حسابی خاوەن قەرز تۆمار دەكرێت .
نیشانەی ( -- ) ئەوە نیشان دەدات كە دراوەكە لە حسابی قەرزدار تۆمار دەكرێت.

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

١. پێناسەی ئەمانە بکە:

(بازرگان – بازرگانی – بازاڕی دراو گۆڕینەوە – نرخی دراو گۆڕینەوە – ڕامیاری بازرگانی دەرەکی – تەعویم – تەرازووی پارەدان).

٢. باس لە گرنگییەکانی بازرگانی دەرەکی بکە؟

٣. ئەو جیاوازییانە کامانەن کە لە نێوان بازرگانی ناوخۆو دەرەکی دا هەیە.

٤. ئەو بنەمایانە کامانەن کە پسپۆڕی نێودەوڵەتی لەسەر دادەمەزرێت.

٥. ئەو گریمانانە کامانەن کە ریکاردۆ بیردۆزەکەی لەسەر داڕشتووە.

٦. ئەرکە سەرەکییەکانی بازاڕی دراو گۆڕینەوە کامانەن؟

٧. ئەو ئامانجانە کامانەن کە سیستەمی چاودێریکردنی دراوی بیانی هەوڵی بەدەست هێنانی دەدات؟

٨. پێناسەی رەسمی گومرگ بکەو مەبەستەکانی دیاری بکە؟

٩. مەبەستمان لە کۆمەك کردن چییە؟ جۆرەکانی دیاری بکە؟

١٠. هۆکارەکانی لاسەنگ بوونی تەرازووی پارەدان کامانەن؟

## لیستی زاراوەکان

| ئینگلیزی | عەرەبی | کوردی |
|---|---|---|
| Trade | التجارة | بازرگانی |
| Export | الصادرات | ناردراوەکان |
| Import | الاستیرادات | هێنراوەکان |
| The theoty of absolutes | نظریة التكالیف المطلقة | بیردۆزەی لەباری رەها |
| The theoty of Comparative costs | نظریة التكالیف النسبیة | بیردۆزی تێچوونی رێژەیی |
| Forign Exchange Market | سوق الصرف الاجنبي | بازاڕی دراوگۆڕینەوەی بیانی |
| Exchange Rate | سعر الصرف | نرخی دراو گۆڕینەوە |
| Tariffs | الضریبة الكمركیة | باجی گومرگی |
| Floating | التعویم | تەعویم |
| Balance of Payments | میزان المدفوعات | تەرازووی پارەدان |

## سەرچاوەکانی بەشی یەکەم و دووەم


١. د. اسماعیل عبدالرحمن و د. حربي محمد عریقات/مفاهیم ونظم أقتصادیة دار وائل للنشر/٢٠٠٤.
٢. د. خالد و د.احمد حسین/ مبادئ اللأقتصاد الكلي /دار وائل للنشر/٢٠٠٤.
٣. د. كریم مهدي الحسناوي، مبادئ علم الاقتصاد، جامعة بغداد، ١٩٩٠.
٤. مصطفى سلمان وآخرون، مبادئ الاقتصاد الكلي، دار المسیرة، ٢٠٠٠.
٥. عبدالله عباوي، مبادئ الاقتصاد، مطبعة سلمى، ١٩٧٨.
٦. د. خزعل البیرماني، الدخل القومي والاستخدام، الجزء الثاني، جامعة بغداد.
٧. د. حسین عمر، مبادئ المعروفة الاقتصادیة، منشورات دار ذات السلال، ١٩٨٩.
٨. د. غازي صالح الطائي/ الأقتصاد الدولي، دار الكتب، موصل، ١٩٨٩.
٩. د. سامي عفیفي حاتم/دراسات في الأقتصاد الدولي، دار المصریة اللبنانیة، ١٩٩٥.
١٠. د. صلاح الدین نامق، التجارة الدولیة، دار المعراف مصر.
١١. د. محمد عبدالعزیز، اقتصادیات التجارة الخارجیة، دار الجامعة القصریة.
١٢. د. كریم مهدي الحسناوي وآخرون، اقتصا للصف السادس الادبي، مطبعة ابوغریب، ٩٩.
١٣. د. رفعت المحجوب، الاقتصاد السیاسي، دار النهضة العربیة، ١٩٧٧.
١٤. د. مهدي رضوان، التجارة الدولیة.

# بەشی سێیەم
## رامیارییە ئابوورییەکان

**ڕامیاری ئابووری** بەوە پێناسە دەکرێت کە **(کۆمەڵێك کار ڕاپەڕاندنە دەوڵەت ئەنجامی دەدات بە ئامانجی ئەوەی کار بکاتە سەر چالاکی ئابووری، ڕامیاری ئابووریش بەوە ناسراوە کە زۆر نەرمە، چونکە بەپێی سروشتی سیستەمی ئابووری و ئەو قۆناغی پێشکەوتنەی کە سیستەمەکە پێی گەیشتووە).**

**ئامانجەکانی ڕامیاری ئابووری:**

ڕامیاری ئابووری هەوڵ دەدات چەند ئامانجێك بهێنێتە دی کە گرنکترینیان ئەمانەیە:

**١-بەدیهێنانی پەرەپێدانی ئابووری:**

لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا ڕامیاری ئابووری تەرخان کراوە بۆ پارێزگاریکردن یان خێراترکردنی پەرەپێدانی ئابووری، هەروەها بەشداریش دەکات لە پێکهێنانی سەرمایەدا لە ڕێگەی ڕەخساندنی ئەو هەلومەرجە لەبارانەی کە کەرتی تایبەتی کاری تیا دەکەن.

بەڵام لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکاندا ئامانجی گرنگی ڕامیاری ئابووری بریتییە لە هێنانەدی پەرەپێدانی ئابووری، ئەمەش لەڕێگەی ئەو هەوڵانەوە دەبێت کە میری دەیدات لەپێناو چاکترکردنی رادەی کەڵك وەرگرتن لە دەرامەتە ئابوورییەکان و بەرزکردنەوەی بەرهەمداری یەکەی کارو پشتگیریکردنی گۆڕینی بەردەوام لە بواری تەکنەلۆجیا و بەشداریکردن لە

پێکهاتنی سەرمایەدا لە ڕێگەی کۆکردنەوەی پاشەکەوتە نیشتمانییەکان، بێجگە لەمانەش هەوڵ دەدات یارمەتی دارایی و هونەری لە دەرەوە دابین بکات، هەروەها کار بۆ پێشخستنی هاتوچۆ و گواستنەوەو پەرەپێدانی دەرامەتە کشتوکاڵییەکان دەکات تا بەهۆیانەوە کاریکاتە سەر پاشەکەوت و وەبەرهێنان.

٢- بەدیهێنانی سەقامگیریی ئابووری:

لەڕێگەی خستنەکاری رامیارییەکانی دارایی و نەختینەیی بۆ چارەسەری هەڵاوسان کە زۆربەی دەوڵەتەکان دەگرێتەوە، بێجگە لەوەی دەیەوێت ڕێگە لەڕوودانی داکشانەوەو بێ بازاری بگرێت.

٣-پاراستنی ئابووری نیشتمانی لە کێبڕکێی دەرەکی:

بە تایبەتیش پاراستنی پیشەسازییە تازە دامەزراوەکان تا بتوانێت پەرەبسێنێت و کارامەیی زیاد بکات و جۆری بەرهەمەکەشی باشتر بکات.

جۆرەکانی رامیارییە ئابوورییەکان:

١- ڕامیاری دارایی:

زاراوەی ڕامیاری دارایی بەشێوەیەکی گشتی ئەوە دەگەیەنێت کە میری هەڵدەستێت بە نەخشەدانان بۆ خەرجیەکان و دابینکردنی ڕێگەکانی پارەدارکردنیان، لە ئامرازە ناسراوەکانیشی (باجەکان و بوجەو قەرزە) کە لە ڕێگەی باجەکان و کورتهێنان و سەررێژی بوجەوە دەوڵەت چەند بوارێکی فراوان دەهێنێتە کایەوە بۆ ئاراستەکردنی خواستی کاریگەر(الطلب الفعال) و نزیك کردنەوەی داهاتی کەسەکان و راستکردنەوەی بنەماکانی ئابووری تا ڕێگەخۆش بکات لەبەردەم پێشکەوتن و گەشەسەندن دا.

ئامانجەکانی ڕامیاری دارایی:

ڕامیـاری دارایـی هــەوڵ دەدات چــەند ئامانجێـك بەدەسـت بهێنێـت کـە گرنگترینیان ئەمانەیە:

أ- گەیشتن بەئاستی خستنەگەڕی تەواوەتی.

ب- گەیشتن بەتێکڕای روو لە زیادبوون لە پەرەپێدانی ئابووری دا.

ج- بەدیهێنانی جێگیربوون لە ئاستی گشتی نرخەکاندا.

د- کارکردن بۆ خۆشگوزەرانی کۆمەڵگەو دووبارە دابەشکردنەوەی داهات بەشێوەیەکی دادپەروەرانە.

٢- ڕامیاری نرخ:

بریتییە لە کۆمەڵێك کارڕاپەراندن کە لە ڕێگەیەوە نەخشەکێشانی نرخەکان و دیاریکردن و کارتێکردنی نرخەکان دیاری دەکرێت تا بە دڵنیاییەوە ئامانجە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بهێنێتەدی.

ئامانجەکانی ڕامیاری نرخ:

أ- کاریکریت بۆ پێشخستنی بەرهەمهێنان لەڕووی چەندێتی و چۆنیەتیەوە.

ب-کـار بکرێـت بـۆ بەرزکردنـەوەی ئاسـتی بەرهەمـداری لـە دەرامەتـە ئابوورییەکاندا.

ج- دابینکردنی پێداویستی بەکاربەرەکان و تێرکردنی ئارەزووەکانیـان و کـار بکرێت بۆ کەمکردنەوەی بەکاربردن.

د- کار بکرێت بۆ هاندانی پاشەکەوت و وەبەرهێنان بەرەو ئەو بوارانـەی کـە لــە خزمــەتی بەرهەمهێنانــە پێویســتییەکاندایەو بــۆ دابینکردنــی پێداویستییەکانی کۆمەڵگە.

## ٣- ڕامیاری بازرگانی:

بریتییە لە کۆمەڵە هۆکارێك کە دەوڵەت لە بازرگانیکردنی دەیگرێتەبەر لەچوارچێوەی پەیوەندییە دەرەکییەکانیدا، بەمەبەستی بەدەستهێنانی چەند ئامانجی نەتەوەیی دیاری کرلو. ئەو ئامانجانەش بەپێی رادەی پەرەسەندنی ئابووری دەوڵەتەکان دەگۆڕێت بۆ نموونە لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکاندا ئامانجەکە لە چوار چێوەی لێکدانەوەکانی (کینز) دا دەبێت کە داوا دەکات خستنەگەڕی تەواوەتی بهێنرێتەدی، بەڵام لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکاندا بە ئامانجی هێنانەدی پەرەپێدانی ئابووری ئاراستە دەکرێت.

## ئامانجەکانی ڕامیاری بازرگانی:

أ–ئامانجی ڕامیاری:

سیستەمە ئابوورییە جۆراوجۆرەکان پەنا دەبەنە بەر دانانی کۆمەڵێك کارراپەراندن و یاساو رێسا کە لە رێگەیانەوە بازرگانی دەرەکی خۆیان رێك دەخەن.

لە سیستەمی سەرمایەداریدا ئەم کارڕاپەڕاندنانە بۆ پشتگیریکردن لە بازاڕەکان دەکرێن، هەروەها لەم وڵاتانەدا جەخت دەکرێت لەسەر پشتگیری کردنی کەرتی تایبەتی وەك لەو کۆمپانیا هاوبەشە گەورانەدا دەردەکەوێت کە ئەرکی هاورده و ناردنی جێبەجێ دەکەن، هەروەها کار دەکەن بۆ ئازادکردنی دراوە نیشتمانییەکانیان بێ هیچ چاودێرییەك، بەمەش ئەو بنەما سەربەستانە دادەنرێت کە بازرگانی دەرەکی پێ رێکدەخەن لەپێناو پشتگیریکردنی سیستەمی سەرمایەدارییاندا.

ب- هاوسەنگی لە تەرازووی پارەداندا:

زیادبوونی کورتهێنان لە تەرازووی پارەدان بە تایبەتیش لە دەوڵەتە تازە پێشکەوتووەکاندا ناچاریان دەکات نەخشەکانیان بەشێوەیەك دابڕێژن کە هاوسەنگی لە تەرازووەکانیاندا دروست بکات، ئەمەش لەڕێگەی زیادکردنی نێردراوەکانیان و قەرزکردن لە دەزگا داراییەکانەوە دەبێت تا جیاوازی نێوان نرخی هێنراو و نێردراوی پێ پڕبکاتەوە.

ج- خستنەگەڕی تەواوەتی:

ئەمەش ئامانجێکی ئاشکرای ڕامیاری بازرگانییە بەتایبەتیش لە دەوڵەتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا، چونکە کار دەکات بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری و کۆمەلآیەتی و ڕامیارییان بەشێوەیەك دەڕوانێتە بێکاری کە بەتایەکی ڕامیاری ترسناکە.

د- هێنانەدی پەرەپێدانی ئابووری:

زۆربەی دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان پاش ئەوەی سەربەخۆی ڕامیارییان بەدەست هێنا پاش جەنگی جیهانی دووەم ڕوویان کردە بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی ڕۆڵەکانیان ئەوانەی کە لە ساڵانێکی دوورو درێژ لەژێر پاشماوەی دواکەوتووی ئابووری و ئیستعماردا بوون، ئەم وڵاتانە پەنایان بردە بەر داڕشتنی ڕامیارییەکی تایبەت بۆ پەیوەندییە دەرەکییەکانیان و ڕێکخستنی ئەم پەیوەندییانە بەشێوەیەك کە سەرڕێژییەکانیان لە دراوی بیانی دا بۆ بهێنتە دی تا لەو ڕێگەیەوە بتوانن ئەو پێداویستییانە بکڕن لە شمەکی سەرمایەداری کە بۆ هێنانەدی پەرەپێدانی ئابووری پێویستن.

هـ- خۆشگوزەرانی ئابووری:

مەبەست لەم ئامانجە بەدیهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتییە لەنێوان چینەکانی کۆمەڵگەدا بەشێوەیەك کە دەوڵەمەندەکان ئەرکێکی زیاتریان بکەوێتە ئەستۆ وەك لە هەژارەکان بۆ نموونە لەوانەیە دەوڵەت رەسمی گومرگی بخاتە سەر چەند شمەکێکی رواڵەتکاری بەرێژەی ٢٠٠٪ لە نرخی شمەکەکان تا رادەی بەکارهێنانیان کەم بکرێتەوەو داهاتێکش کۆ بکاتەوە لە داهاتە بەرزەکان، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە دووبارە دابەشبوونی داهات لەنێوان هاولاتیان بهێنێتە کایەوەو شمەکە پێویستەکانیش بهێنێتە ناوەوە کە بۆ زۆرینەی خەڵکن.

٤- ڕامیاری نەختینەیی:

بریتییە لە هەموو ئەو کارڕاپەڕاندنانەی کە لە لایەن میری و بانکی ناوەندی و خەزێنەوە دەگیرێنەبەر، بەمەبەستی کارکردنە سەر بڕی پارە و پەیداکردنی پارەو بەکارهێنانی پارە و متمانەپێدان بە ئامانجی گەیشتن بە ئامانجێکی ئابووری دیاری کراو وەك ئامانجی ئیشگێڕانی تەولوەتی.

ئامانجەکانی ڕامیاری نەختینەیی:

ڕامیاری نەختینەیی هەوڵ دەدات چەند ئامانجێکی دیاری کراو بە دەست بهێنێت کە دەتوانرێت لەمانەی خوارەوەدا کورت بکرێنەوە :

أ-هێنانەدی ئاستێکی بەرز لە کارپێدان: ئابووریناسەکان هەموویان کۆکن کە پێویستە دابینکردنی ئاستێکی بەرز لە کارپێدان بە ئامانجیك دابنرێت کە

ڕامیاری نەختینەیی هەوڵی بۆ دەدات، مەبەستیش لەم ئامانجە ئەوەیە کە دەسەڵاتە نەختینەییەکان ئاگاداری جێگیرکردنی چالاکی ئابووری لە بەرزترین ئاستی گونجاو لە خستنەگەڕی دەرامەتە سروشتی و مرۆییەکان، پێویستە لە سەر دەسەڵاتە نەختینەییەکان هەموو ئەو کارڕاپەڕاندنانە پەیڕەو بکەن کە ئابووری دوور دەخەنەوە لە بێکاری و ئەو شوێنەوارانەی داکشانەوانەی کە لە بەرهەمهێنان و داهات و بارگرژی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕوو دەدات لەو کارڕاپەڕاندنانەش بەرزکردنەوەی قەوارەی خواستی هەمووەکی بۆ ئاستی پێویست لە خستنەگەڕی ئەو دەرامەتە بەرهەمهێنەکیانەی سوودیان لێ وەرنەگیراوە.

ب-جێگیرکردنی ئاستی نرخەکان: ئەم مەبەستەش لەوەدا کۆدەکرێتەوە کە کار بکرێت، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕانە توندو تیژ و بەردەوامەکانی ئاستی نرخەکان، چونکە ئەوانە لەگەڵ خۆیاندا چە ندین گۆڕانکاری لە بەهای پارەدا دروست دەکەن و دواتر کاریگەری خراپ دەکەنە سەر ئاستی دابەشکردنی داهات و سامان تەرخانکردنی دەرامەتە ئابوورییەکان بەسەر لقەکانی بەرهەمهێناندا.

ج-هاندانی پەرەسەندنی ئابووری: کاریگەری ڕامیاری نەختینەیی لە هاندانی پەرەسەندنی ئابووریدا لەوەوە دەردەکەوێت کەکار بکاتە سەر وەبەرهێنان، چونکە ئەو گۆڕانکارییانەی ڕامیاری نەختینەی دەیهێنێتە کایەوە لە یەدەگە نەختینەیەکانی بانکە بازرگانییەکان کار دەکاتە سەر بڕی خستنەڕووی پارە،ئەمەش گۆڕانێکی هاوشێوە لە نرخی سوودا دێتە کایەوە کە ئەمیش بەپێی ڕۆڵی خۆی قەبارەی وەبەرهێنانی تایبەت دیاری دەکات.

د-چاکترکردنی تەرازووی پارەدان: تەرازووی پارەدان بۆ هەموو وڵاتێك پەیوەندی نەختینەیی و دارایی و بازرگانی ئەو وڵاتە دەردەخات لەگەڵ وڵاتەکانی تری جیهاندا، ئەم تەرازووە کاتێك لە بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتەدا دەبێت کە وەرگرتووەکانی لە دراوی بیانی (گرانبەها) دەرەوە زۆرتر بێت لە پێدانەکانی بە دەرەوە وە پێچەوانەکەشی راستە.

هەموو دەوڵەتەکان هەوڵی ئەوە دەدەن کە تەرازووی پارەدانەکانیان بەلای بەرژەوەندییەکانیاندا بێتە خوارەوە لەهەر پلەیەکی پێشکەوتنی ئابووری دابن تا بتوانن پارێزگاری بکەن لەو یەدەگی زێرو دراوی گرانبەهایانەی کە هەیانە کورتهێنانیش لە تەرازووی پارەداندا مانای ئەوەیە کە ئەو وڵاتە دراوێکی بیانی زیاتر دەدات لەوەی کە وەریگرتووە ئەمەش شوێنەواری خراپ لەسەر بەهای دەرەکی دراوە نیشتمانییەکەی دروست دەکات.

٥-ڕامیاری کشتوکاڵی:

مەبەست لە ڕامیاری کشتوکاڵی ئەو کارڕاپەڕاندنانەیە کە دەوڵەت ئەنجامی دەدات و چەندین ڕێگەو شێوازی چاکسازی کشتوکاڵی گونجاو دەگرێتە خۆی کە دەتوانرێت بەهۆیانەوە بەرزترین رادەی خۆشگوزەرانی بۆ کارگەرانی کەرتی کشتوکاڵ لەڕێگەی زیادکردنی بەرهەم و چاکترکردنی جۆرەکانیان و بەردەوام بوون لەسەر ئەو چاکتر کردنانە دابین بکات.

## ئامانجەکانی ڕامیاری کشتوکاڵی:

أ- چاکترکردنی ئابووری کشتوکاڵی بە ئامانجی بەشداریکردنی گەورەترو بەبایەختر لە ئابووری نەتەوەییدا.

ب-بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی ژیانی کارکەرەکانی ئەم کەرتە.

ج- دابینکردنی پێداویستییەکانی کەرتی پیشەسازی لەکەرەستەی خاوی کشتوکاڵی.

د- ناردنە دەرەوەی بەشێك لە بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بە ئامانجی بەدەستهێنانی دراوی بیانی کە بۆ هێنانە ناوەوەی ئەو شمەکانەی لە کرداری پەرەپێدانی ئابووری پێویستن.

## پێداویستییەکانی ڕامیاری کشتوکاڵی:

ڕامیاری کشتوکاڵی ناتوانێت ئامانجە دیاریکراوەکانی خۆی بەدەست بهێنێت ئەگەر ئەم پێداویستییانەی بۆ دابین نەکرێت:-

١) پێویستە ڕامیاری کشتوکاڵی لەلایەن دەسەڵاتێکی میری یان نیمچە میرییەوە دەرکرا بێت و بەرنامەیەکی کردارەکی ئەوتۆی هەبێت کە سەرپەرشتی جێبەجێکردنی ئەنجامدانی بکات.

٢) پێویستە ڕامیاری کشتوکاڵی ئامانج و مەبەستی دیاریکراوی خۆی هەبێت و هەوڵی بەدەستهێنانیان بدات، کە ئامانج و ئارەزووی زۆرینەی خەڵك بنوێنێت.

٣) ڕامیاری کشتوکاڵی پێویستی بە ئامرازی دیاریکراو هەیە تا ئامانجەکانیان بە کەمترین ئەرك و تێچوون بەدی بێنێ.

٤) لەکاتی دیاریکردنی ئامرازو کارڕاپەراندنەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان، پێویستە ڕەچاوی ئەو هەلومەرجە ناوخۆییانە بکرێت کە ڕێگر دەبێت لە بەجێبەجێکردنی بەرنامەکەدا.

## پرسیارەکانی بەشی سێیەم

١. پێناسەی ئەمانە بکە:

(رامیاری ئابووری، رامیاری دارایی، رامیاری نرخ، رامیاری بازرگانی، رامیاری کشتوکاڵ).

٢. ئامانجەکانی رامیاری ئابووری کامانەن؟

٣. ئامانجەکانی رامیاری دارایی کامانەن؟

٤. ئامانجەکانی رامیاری نرخ کامانەن؟

٥. ئامانجەکانی رامیاری نەختینەیی کامانەن؟

٦. پێویستیەکانی رامیاری کشتوکاڵ کامانەن؟

## سەرچاوەکانی بەشی سێیەم


١. د. اسماعيل عبدالرحمن و د. حربي محمد عريقات/مفاهيم ونظم أقتصادية دار وائل للنشر/٢٠٠٤.

٢. د. خالد و د.احمد حسين/ مبادى اللأقتصاد الكلي /دار وائل للنشر/٢٠٠٤.

٣. د. عبدالوهاب مطر الداهري/ الأقتصاد الزراعي/ مؤسسةدار الكتب١٩٨٠.

٤. د. عوض فاضل / النقود والبنوك/ مطبعة وزارة التعليم العالي ١٩٩٠.

٥. د. جلال عبدالرزاق و د. خزعل الجاسم/ الأقتصاد/ مطبعة ابو راغب١٩٩٧.

٦. د. غازى صالح الطائي/ الأقتصاد الروبي/ دار الكتب للطباعة والنشر ١٩٩٩.

٧. د. سامي عفيفي حاتم/دراسات في الأقتصاد الروبي/دار الميسرية اللبنانية١٩٩٥.

# بەشی چوارەم

## دواکەوتن و پەرەپێدانی ئابووری

## دواکەوتن

## UNDER DEVELOPMENT

هـزری ئـابووری هاوچـەرخ پێناسـەی زۆری بـۆ دواکـەوتن لـەخۆ گرتـووە، هەندی لەوانە ئەو ولاَتە بەدواکەوتوو دادەنێن کە ئابوورییەکـەی لـە بنەڕەتـدا پشـت بـە پیشەسـازی کەرەسـتەی خـاوی (وەك کشـتوکاڵ و کانزاکـاری) ببەستێت، هەندێکی دیکە بە ئابووری پاشکۆ (کلکایـەتی) نـاوزەدی دەکـەن، یاخود ئابووری سەرچاوە(کەرەستەی خاو) ببەستێت.

بـەلاَم مانـای فـراوان و بـەربڵاوی دواکـەوتوویی بـەگوێرەی رای ئابووریناس (تۆدارۆ M. P. Todaro) (بریتییە لەو بارە ئابوورییـەی کـە بـە نزمـی ئاسـتی بژێوی ژیان هاوشان لەگەڵ هەژارییەکی بەرەو خوار نیشـانە دەکریَ، ونزمـی سـەرمایەس تاکەکـەس، نزمـی ڕێـژەی گەشـەکردنی ئـابووری، نزمـی ئاسـتی بـەکاربردن، خزمـەتگوزاری تەندروسـتی کەمـە و بـەش ناکـا، ڕێـژەی بـەرزی لەدایکبوون، کەمی سەربەستی هەڵبژاردنی ئەو چالاکییانەی کـە دەبنـە هـۆی پڕکردنەوەی ئارەزووەکانی مرۆڤی بەکاربەر).

**تایبەتمەندییەکانی دواکەوتوویی ئابووری:**

**١-کەمی سەرمایە:**

زۆربەی ئەو وڵاتانەی ئابوورییان دواکەوتووە ئەوانەن کە هەندێك یان هەموو هۆیەکانی بەرهەمهێنانیان(بەمانا سەرمایەدارییەکەی)نییە، لەوانەش سەرمایە، بەشی پێویستی پارەدارکردنی پرۆژەکانی پەرەپێدان ناکات، بۆیە لەژێر رۆشنایی ئەم کەموکورتییەدا ئابووریناس(**نرکسە Nurkse**)دەڵێ: (**دەوڵەت بە دواکەوتوو دادەنرێت لە بەر ئەوەی هەژارە**).بۆ روونکردنەوەی ئەم بیرۆکەیەش (نرکسە) پشت بەم شیکردنەوەیە دەبەستێ:

کەمبوونەوەی سەرمایە یان کەڵەکەبوونی لە بازاڕی درلودا بەستراوە بە لایەنی خواست و خستنەڕووی هەمووەکییەوە. خستنەڕووی سەرمایەش زۆربەی کات نزمە بە هۆی لاوازیی ئارەزووی سنوورەکی بۆ پاشەکەوتکردن یان زێدەڕۆییکردن لە ئارەزووی سنوورەکی بۆ بەکاربردن، ودابەزینی داهاتەکانی رەخساو بۆ خەرجکردن، لە دەرەنجامی تێکچوونی بەرهەمی کەرتە سەرەکییەکانی ئابووری دێتەکایەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی بازنەیەکی داخراو، هەروەك لەم هێڵکارییەدا روون کراوەتەوە:




**٢- دواکەوتوویی ئامراز و ڕێگاکانی بەرهەمهێنان:**

لاسەنگی پەیکەریەندی کە ولاتـانی دواکـەوتووی پـێ جیـا دەکرێتـەوە خۆی لە سـەرەتایی هۆکارەکـانی بەرهـەمهێنان دەبینێتـەوە، بـۆ نموونـە لـە کـەرتی یەکەمـدا (کـەرتی کشـتوکاڵدا) شـێوازی بەرهـەمهێنان پشـت بـەکاری دەستی و بەکارهێنانی ئاژەڵ دەبەستێت، بە دەگمەن پرۆژەی پەرەپێدان بۆ چاك کردن و ڕەخسـاندنی زەوییـەکان بـۆ کشـتوکاڵکردن ئـەنجام دەدرێ بـۆ ئەوەی ئەو ئەنجامە چاوەڕوانکراوەی لێ بێتەدی.

دواکەووتنی شێوازەکانی بەرهـەمهێنان لـەم ئابووریانـەدا دەگەڕێتـەوە بۆ: نەبوونی هۆیەکانی تەکنیکی تـازەی هـاوردە تـا بەرهەمهێنـەکان بـەکاری بێنن.

خراپــی و نــەگونجانی بــارودۆخی ئــابووری و کۆمەڵایــەتی و رۆشــنبیریش یارمەتیدەرن بۆ دروستبوونی ژینگەیەك (بارێك)ی وا کە ناهێڵێ تەکنــەلۆژیای تازە لەکرداری بەرهەمهێناندا بەکاربێ.

لەم روانگەیەوە شــارەزایانی نەتــەوە یــەکگرتووەکان لــە توێژینەوەکانیانــدا ئاماژە بەوە دەکەن کە وڵاتانی دواکەوتوو دەتوانن بەرهەمــەکانیان لەکــەرتی کشتوکاڵ بەرێــژەی ٥٠٪ زیــاد بکــەن لەماوەیــەکی مامناوەندیــدا، ئەگــەر ئــەو وڵاتانە توانیان شــێوازەکانی تــازەی بەرهــەمهێنان بێــنن و رێگاکــانی تــازەش بەکار بێنن بۆ پاراستنی بەروبوومی چاندراویان لە دەردو بەڵاکانی ژینگەیی.

یەکێك لەنیشــانە دیارەکــانی کــەرتی کشــتوکاڵی لــە وڵاتــە دواکەوتووەکانــدا بریتییە لە بــەرزی ژمــارەی (رێــژەی) بێکــاران لــە کرداری بەرهــەمهێنان، بــە بەراورد(لەچاو) سەرجەمی هێزی کارگــەری ئــابووری نەتــەوەیی، کــە ئەمــەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی دیاردەی بێکاری شاراوە (ژێــر پــەردە) کــە ئەمــەش خۆی لەخۆیدا نزمی بەرهەمی یەك دۆنمی لێ دەکەوێتەوە، هەروەها ناوەنــدی بەرهەمداری تاکە کەسیش لــە کشــتوکاڵدا نــزم دەبێتــەوە، چونکە بەرهــەمی سنوورەکی جوتیارەکە سفر دەبێت یاخود سالب.

هاوبەشیکردنی کەرتی کشتوکاڵی لــەکرداری کەڵەکەبوونــدا زۆر نــزم دەبــێ، چونکە ئەگەر زیادەی ئابووری هاتــەدی ئــەوا لەلایــەن خــاوەن زەوییەکانــەوە ئاراستە دەکرێ، یان بەرەو بەکاربردنی خۆشــگوزەرانی یــانیش لــە دەرەوەی کەرتەکە دەکات بێ ئەوەی هاوبەشی بکات لەکرداری بوژانەوەو گەشەپێدانی شێوازی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی.

دواکەوتوویی شێوازەکان و ڕێگاکانی بەرهەمهێنان کاریگەری خراپی لەسەر ئابووری هەیە، کە دەتوانن گرنگترینیان بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە:-

١. بوونی بێکاری ئاشکرا لە لادێکان لە شێوەی (بێکاری خۆویست و خۆنەویست) دەردەکەوێت.
٢. زاڵبوونی دیاردەی کۆچکردن لە لادێوە بۆ شار کە ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری و فرلوانبوونی دیاردەی کاری (لابەلا).
٣. نزمی دابینکردنی کەرەستەی خاوی کشتوکاڵی بۆ دامودەزگا پیشەسازییەکان.
٤. کەم توانابوون لە پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگە.
٥. توانای کڕین لای زۆریەی دانیشتوانی لادێ نزم دەبێت بەهۆی کەمی بەرهەم و خراپ دابەشکردنی داهات.
٦. دواکەوتوویی هەریەك لە شێوازەکانی بەرهەمهێنان و هێزەکانی بەرهەمهێنان لەکەرتی کشتوکاڵیدا کاریگەریەکی خراپیان لەسەر کەرتەکانی تری ئابووریدا دەبێت.

٣- گەشەکردنی دانیشتوان:

پەرتووکە ئابوورییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەوا پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان ڕێژەی هەژاری و تێکڕای گەشەکردنی دانیشتواندا هەیە، شایانی باسە هەمیشە نەهامەتییە خراپەکانی ئابووری دەکەوێتە سەر شانی چینی هەژاری کۆمەڵگە، چونکە ئەم چینە لەبنەڕەتدا بەدەست بێ مولکی و نەبوونی خزمەتگوزارییە گشتییەکانەوە دەناڵێنن، هەر بۆیەش زۆریەی جار

ئەوانە لەپێشەنگی قوربانیانی بێکارین بەهۆی سستی گەشەکردنی ئابووری، ئافرەتانیش بەشێوەیەکی تایبەتی شوێنەواری ئەو بێکاری و ڕێوشوێنە ئابوورییە لێك ترازاوانەی تر هەڵدەگرن کە دەوڵەت دەیانگرێتەبەر، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا دەبێتە هۆی دروستبوونی بازنەیەکی تری داخراو تا ئەو پلەیەی کە خێزانە قەبارە گەورەکانیش دەناڵێنن بەدەست هەژاری بەردەوام و نەبوونی یەکسانی لە کۆمەڵگەدا.

هەروەها گەشەکردنی دانیشتوان دەبێتە هۆی دیاردەیەك کە لە زانستی ئابووری پێی دەگوترێ دەرکەوتنی دیاردەی زیادبوونی خەرجییە گشتییەکان و کەمبوونەوەی پارەدارکردن لە خزمەتگوزارییە گشتییەکانی وەك فێرکردن و تەندروستی و لەناوبردنی پیسبوونی ژینگەو زیادبوونی هاوردەنی بۆ دوورکەوتنەوە لەو مەترسیانەی کە دەبنە هەڕەشە بۆ ئاسایشی خۆراکی دەوڵەت.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لە زیادبوونی ڕێژەی دانیشتوان زۆرجار دەبێتە هۆی زیادبوونێکی بەرچاوی ئەوانەی تەمەنیان لە ١٥ ساڵ کەمترە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی کەسانی بەکاربەر لە کۆمەڵگەدا، کە هێشتا توانای بەرهەمهێنانیان نییە، جا ئەگەر ئەو نزمبوونەوەیە هەستپێکراوەی لە بەهیوابوون بەژیان وەربگرین لەوانەی کە تەمەنیان لە(٤٠) ساڵ کەمترە، ئەوسا دەردەکەوێ کە نزمبوونەوەی ساڵەکانی بەرهەمهێنان بەرەو (سفر) دەڕوات، ئەم دیاردەیە لە وڵاتە دواکەوتوەکاندا دەبێتە هۆی فراوانبوونی کەلێنی هەڵاوسان، چونکە ئەم وڵاتانە بەدەست دواکەوتوویی هەردوو لایەنی پیشەسازی و کشتوکاڵیەوە (وەك یەك) دەناڵێنن.

### ٤-بڵاوبوونەوی بێکاری: Unem ployment

ئابووریناسانی جیهانی سێیەم کۆکن لەسەر بوونی بێکاری شاراوە (ژێر پەردە) لە وڵاتانی دواکەوتوو لە گشت کەرتەکانی بەرهەمهێناندا، ئەم جۆرە بێکارییەش زیاتر لەکەرتی کشتوکاڵی بەدیار دەکەوێ، چونکە ئەم کەرتە کەرتی پێشەنگە و زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵگەش بۆ بەدەستهێنانی هەلی کارکردن و وەبەرهێنان پشت بەم کەرتە دەبەستن. جا لە رووی تیۆرییەوە ئەگەر ژمارەیەکی زۆری کارکەران لەم کەرتەدا وازیان هێنا ئەوا کاریگەری لەسەر بەرهەمهێنان نابێ، چونکە بەرهەمهێنانی سنوورەکییەکەی دەکاتە پلەی سفر بە هۆی لاوازی پەیکەربەندی پیشەسازی لە کەرتەکانی تری بەرهەمهێناندا، ناتوانرێ ئەو ژمارە زۆرەی بێکاران دابمەزرێندرێ و کاریان پێبدرێ.

ئەم جۆرە بێکارییە لە ئابووری دواکەوتوودا دەبێتە هۆی کۆچکردن لە لادێ بۆ شار، بۆ بە دەستهێنانی هەلی کارکردن کە ئەمەش دەبێتە هۆی زۆربوونی دیاردەی بێکاری لە شاردا، چونکە ئەم بەشەی جوگرافیەی شارەکان خۆی لە بنەڕەتدا بە دەست دیاردەی بێکارییەوە دەناڵێنێ، وڵاتانی دواکەوتوو لەسایەی ئەم دیاردەیەدا بە دەست بێکاری کراوە(بێکاری خۆویست یان بێکاری خۆنەویست) دەناڵێنن، هەر وەك ئابووریناسە رۆژئاواییەکان ئەم ناوەیان لێ ناوە، کەرێژەی ١٠ — ٢٠٪ هێزی کارکەران دەگرێتەوە، جا رێژەی بێکاریش لە نێو لاوانی خوێندەواردا بەرزترە، بە تایبەتی لە لادێ، چونکە ئەم بێکارانە هیچ دەرامەتێك یان توانایەکیان نییە بۆ چاککردنی باری ئابووریان بە بەراورد بە هاوشانە بێکارەکانیان لە شاردا، کە کرێیەکی کەم وەردەگرن، ئەم دیاردەیەش پەیوەندی بە گیروگرفتی هەژارییەوە هەیە لە

ولآتە دواکەوتووەکاندا، هەر بۆیەش دامەزراندن وخستنە سەرکار جێگایەکی سەرەکی داگیرکردووە لە لێکۆڵینەوەی دیاردەی بێکاری و چۆنێەتی چارەسەرکردنی لەم ولآتانەدا.

### ٥ - دواکەوتوویی پەیکەربەندی کۆمەلآیەتی:

زۆرجار لەپشت دیاردەکانی دواکەوتنی ئابوورییەوە، دیاردەیەکی دیکە هەیە کە بریتییە لە دیاردەی لاوازی (حەتمیەتی) رۆشنبیریە، واتە رۆشنبیری گشتی تاکەکان رەنگدانەوەیەکی بەرچاوی لەسەر پلەی دواکەوتن دابەزینی ئاستی رۆشنبیری و کۆمەلآیەتی هەیە، کە دەبنە هۆی دەرکەوتنی زۆر لەو دەرەنجامانەی کە وا دەکەن هەلی گونجاو نەرەخسێت بۆ بە دیهێنانی پەرەپێدان و دەبێتە هۆی بەردەوامی حاڵەتی دواکەوتن، و گرنگترین دەرئەنجامەکانی دواکەوتوویی پەیکەربەندی کۆمەلآیەتی ئەمانەن:

١-کاریگەری دابو نەریت لە سەر خەرجی بەکاربردنی هەمووەکی، کە زۆربەی کات ئارەزووی سنوورەکی بەکاربردن زۆر بەرز دەبێتەوە و خەرجکردنیش بەرەو بە کاربردنی خۆشگوزەرانی و بەمەبەستی شانازی بە خۆکردنە.

٢-داب و نەریتەکان رۆڵیان هەیە لە شێوازی پاشکەوتکردندا، کاتێ پاشکەوتکردن ئاراستەی لایەنەکانی بەرهەم نەهێن دەکرێ وەکو جامبازی لە کرین و فرۆشتنی زەوی وزار وکانزا گرانبەهاکان و زیادکردنی پشتێنەی (رصید) دراو.

٣-تەمبەڵی و هەست نەکردن بە بەرپرسیاریەتی دەبنە هۆکار بۆ ئەوەی فاکتەری کات بە شێوەیەکی دروست لەو بوارانەی سوودبەخشن بۆ وەبەرهێنان بەکار نەهێنرێ.

٤- نزمی ئاستەکانی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و نزمی ئومێدی تاکەکان، وا لە تاکەکان دەکات بە کەمترین ئاستی خۆشگوزەرانی ژیان رازی بن و ، بۆ چاککردنی بارودۆخی ئابوورییان و فێربوونی هونەری نوێی بەرهەمهێنان لە کەرتەکانی بەرهەمهێنانی پێشەنگدا گرنگی بە وەبەرهێنانی تواناکانیان نەدەن.

٥- بە هۆی حوکمی داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان ئافرەت هان نادرێ بەشداری لە چالاکییە ئابوورییەکان بکات.

٦-بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری و نزمی ئاستی فێربوون وا دەکەن توانای تاکەکان لەبواری بەرهەمهێنان و لێهاتوویی کارگێری لە کۆمەڵگەدا لاواز بێت. نەخوێندەواری دەبێتە هۆی لەدەستدانی هۆشیاری تەندروستی و زیادبوونی پیسبوونی ژینگەو بڵاوبوونەوەی دەرد و نەخۆشی لە وڵاتانی دواکەوتوو.

## ٦- پاشکۆیەتی ئابووری:

ئابووریناسانی قوتابخانە پەیکەریەندییەکان(Structural School) کۆکن لە سەر ئەوەی کە بازرگانی دەرەکی سەرچاوەیەکی گرنگی پاشکۆیەتی ئابووری وڵاتانی دواکەوتووە (**ئابووریناس پریبش Prebish**) کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی پەیکەریەندیی (الهیكلیة) لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی، پێیوایە وڵاتە دواکەوتووەکان تەنها لە بازرگانی چەند کەرەستەیەکی سەرەتایی پسپۆرن کە ئەمەشە دەبێتە هۆی پاشکۆیەتی ئەم وڵاتانە لەو گۆرانکارییانەی لە ئاڵوگۆری شمەك لەبازارەکانی جیهانیدا روو دەدەن. (TOT) Terms of trade.

هەروەها (پریبیش) لە توێژینەوەکانی گەیشتە ئەو دەرەنجامەی ئەو گۆڕانانەی کە لە نرخی کەرەستە خاوەکان لە بازاڕەکانی وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی روودەدەن بەشێوەیەکی بەردەوام لە بەرامبەر شمەکە بەرهەمهێنراوەکانی بەریتانیادا لە دابەزین دان، بەگوێرەی رای ئەم قوتابخانەیەش هۆی سەرەکی دابەزینی رێژەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی وڵاتە دواکەوتووەکان بۆ ئەو پێوانە جیاوازانەی نەرم نواندنی داهات بۆ خواست لەسەر بەرهەمەکانی وڵاتانی پەیوەندیدار(وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی)، هەروەها بۆ سەرکەوتنی تەکنەلۆژی لەسەر خستنەرووی شمەك لە بازرگانی جیهانیدا دەگەڕێتەوە.

دلواکاری وڵاتانی پێشکەوتوو لەسەر شمەك و کەرەستەی سەرەتاییەکانی وڵاتە دواکەوتووەکان لە رووی داهاتەوە نەرمی تیا دەنوێنرێ، و بەپێی **یاسای ئەنگڵ**(Engle Law) لە وڵاتە پیشەسازییەکان خواست لەسەر کەلوپەلی خۆراکی تارادەیەك نزم دەبێتەوە لەگەڵ ئەو زیادبوونەی کەبەسەر داهاتدا دێت، بۆیە ئەم وڵاتانە پەنا دەبەنە بەر کەمکردنەوەی داهاتەکانیان لە کەرەستەی سەرەتایی و کەلوپەلی خۆراك.

جگە لەمەش ئەم وڵاتانە لە میانەی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەی کەبەدەستیان هێناوە توانیان بڕێکی زۆری دەرامەتی سروشتی بەرهەمبهێنن کە پێشتر لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا دەیانهێنا بەرێگایەکی پیشەسازی، لەبەر ئەم هۆیە دابەزینی خواست دەبینین لەسەر زۆر لە کەرەستە سەرەتاییەکان بەتێپەڕبوونی کات لە بازارەکانی جیهانیدا، لە بەرامبەریشدا زۆربوونی خواستی شمەکی وەبەرهێنەکی و کەلوپەلی خۆراك دەبینین لەلایەن وڵاتە دواکەوتوەکاندا لە وڵاتە پێشکەوتوەکاندا بەهۆی فراوانبوونی کەلێنی

هەڵاوسان لە بازاڕی شمەك دلو پێویست بوونی پیشەسازییە ناوخۆییەکان بە کەلوپەل و بڕینی پەیوەندی و هاموشۆ لەلایەن وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کە ئەمانە دەبنە هۆی پلەیەکی بەرزی نەرمی نواندن.

لەلایەنی خستنەڕووەوە، وڵاتە پیشەسازییەکان بەهۆی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیەی کە بەدەستیان هێناوە توانیویانە زیادبوونێکی بەهێز لەبەرهەمهێناندا بەدەست بێنن لە کەرتە پێشەنگەکانی ئابووری دا، لەم روانگەشەوە وڵاتە پیشەسازییەکان توانیان زۆر بەهێزەوە بەرگری لەپێگەی رکابەرایەتیان بکەن بەهۆی خستنەڕووی شمەك و کاڵای جۆراوجۆری زۆر پێشکەوتووی نرخ گونجاو.

ئەم پەرەسەندنە وای لە وڵاتە پیشەسازییەکان کرد کە نرخەکانی خۆی بسەپێنێ و رامیاریەکانی نرخی جۆرلوجۆریش بگرێتە بەر، چونکە بەهۆیەوە قازانجێکی زۆری لێوە دەست دەکەوێ.

رێژەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی وڵاتە پیشەسازییەکانیش پەرەسەندوترە لەچاو(بەبەراورد)لەگەڵ رێژەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی وڵاتە دواکەوتوەکان، لەمەشەوە هاوردەنی نەختینەیی لەبازرگانی دەرەکیدا هاوبەشی ناکات لە کرداری پەرەپێدانی ئابووری لە زۆربەی وڵاتانی دواکەوتوو لەئابووریدا.

# پەرەپێدانی ئابووری

**چەمکی پەرەپێدان:**

پێش ئەوەی ئاماژە بە پێناسەی پەرەپێدانی ئابووری بکرێت، پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێوان هەردوو دەستەواژەی (پەرەسەندنی ئابووری) و (پەرەپێدانی ئابووری) کە تەنانەت وایان لێ هاتووە یەك مانا ببەخشن، (**پەرەسەندنی ئابووری**) ئاماژە دەکات (زیادبوونی بەردەوامی داهاتی راستەقینەی تاکەکەسە لە دەوڵەتێکدا بەهۆی چاککردنی بەردەوام لە هۆیەکانی بەرهەمهێنان لەگشت بوارەکاندا)، کەچی (**پەرەپێدانی ئابووری**) (واتە کرداری چاك کردنی چۆنایەتی لە ژیانی مرۆڤدا). لە بابەتی پەرەپێداندا پەرتووکە ئابوورییەکان ئاماژە بەبوونی چەند دیاردەیەکی گرنگی پەرەپێدان دەکەن کە پێویست دەکات لێرەدا بەم خاڵانە باسیان بکەین:

١. بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەران و خزمەتگوزاریی تاکەکەسەکان لە میانەی کرداری پەرەسەندنی ئابووری .

٢. رەخساندنی بارێکی گونجاو بۆ نەشونماکردنی هەست کردنی تاکەکەس بە خۆشگوزەرانی لەمیانەی بنیادنانی سیستەمێکی کۆمەلایەتی و رامیاری و ئابووری و دام و دەزگایی کە ئامانجیان رێزگرتنی شکۆمەندی (کرامة) هاوولاتییە.

٣. زیادکردنی سەربەستی مرۆڤ لەمافی دەستنیشان کردن لەمیانەی فرلوانکردن و جۆرلوجۆرێتی کردن لە حەزو ئارەزووەکانی تاکەکەس، وەك زیادکردنی جۆرەکانی شمەکی بەکاربەرەکی و کارگوزاری.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجانەی پەرەپێدان لە ولاتە دواکەوتووەکاندا لە سەر دەولەت پێویستە رێو شوێنی کرداری و هۆشیارکەرەوەی پلان بۆ داڕێژراو بگرێتە بەر بۆ گۆڕانکاری و بازدان لەشێوەو ناوەرۆکەوە ئەمیش لەرێگای سازکردنی تەقەلاو تولنا جۆرلوجۆرەکان لە پلانێکی ئامادەکراو بۆ ئەم مەبەستە.

## پێویستییەکانی پەرەپێدانی ئابووری:

### ١. کەلەکەکردنی سەرمایە:

پێکهێنانی سەرمایە ئەو کاتە دێتە بەرهەم کەوا کۆمەلگە رێژەیەك لە داهاتی بەگەڕ پاشەکەوت بکاو وەبەرهێنرێ بۆ بەدەستهێنانی بڕێکی زیاتری بەرهەم و داهات. بێگومان کارگە تازەکان ئامێرو مەکینەکان و کەرەستە خاوەکان دەبنە هۆی زیادکردنی ماددی سەرمایەی دەولەت (بەهای راستەقینەی پوختی سەرتاپایی سەرجەم شمەکە سەرمایەدارەکانی لەرووی مادییەوە بەرهەمیان هەبێ) کە لەوانەیە ئابووری لەئاستی بەرهەمهێناندا فراوانتر بکات.

ئەو وەبەرهێنانە بەبەرهەم و راستەوخۆیانە هاوکات وەبەرهێنانی تری زیادەشی شان بەشان لەگەلدا دەڕوات کە لە پەرتوکە ئابوورییەکان بە(ژینگەی کۆمەلایەتی و ئابووری ) ناسراوە، وەك رێگاوبان، کارەبا، پالاوگەکانی ئاو، گەیاندن و هاوشێوەیان کە یارمەتی دەرن بۆ بەیەکەوە گرێدانی جموجۆلە ئابوورییەکان و کرداری پەرەپێدانیش ئاسان دەکات، ئەو نموونەکە جێبەجێکاری خوارەوە یارمەتی تێگەیشتنی ئەم بیرۆکانە دەدەن.

ئەگەر وەبەرهێنان لە دەزگایەکی کشتوکاڵی (وەك کڕینی تراکتۆر) بۆ نموونە ببێتە هۆی زیادکردنی بەرهەمی هەموەکی لە کێڵگەدا، بەڵام بەبێ هۆیەکانی گواستنەوەی تازە جوتیار ناتوانێ شمەکە بەرهەمهێنراوەکەی ساغ بکاتەوەو بیخاتە روو بۆ فرۆشتن لە بازاڕەکاندا، بۆیە ئەم وەبەرهێنانە لەوانەیە هیچ شتێکی زیادە نەخاتە سەر بەرهەمهێنانی نەتەوەیی.

چەند رێگایەکی ناڕاستەوخۆی وەبەرهێنان هەن لە دەرامەتە نەتەوەییەکان وەك بنیادنانی دەزگا بۆ ئاودانی زەویەکان کە دەبێتە هۆی چاککردنی زەویە کشتوکاڵییەکانی وڵات کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەرهەمداریی بۆ هەر تۆنمێك زیاتر دەکات، جا بۆ نموونە ئەگەر توانرا بۆ (١٠٠) هکتار زەوی کشتوکاڵی کە هەمان بڕی بەرهەمی (٢٠٠) هکتار زەوی دێمەکار (کە پشت بە باران دەبەستێ) بدات بەدەستەوە، کەواتە بنیادنانی مەکینەش بۆ ئاودانی زەوییە کشتوکاڵییەکان وا دەکات کە بڕی بەرهەمی ئەو زەویانەی کە دێمەکار نین دووهێندە بێ. بەهەمان رێگاش دەتوانرێ بەرهەمداری زەویە کشتوکاڵییەکان زیاد بکری ئەگەر بێت و دەرمانی لەناوبردنی مێرووە زیانبەخشەکان بەکار بهێنری ، هەموو ئەو جۆرە وەبەرهێنانانە ئەو رێگاو پێناوە ماددیانە دەنوێنن بۆ چاك کردنی شێوەی زەوییەکان کەخۆی لەخۆیدا دەبێتە زیادکردنی بەرهەمداری زەوی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە.

٢. وەبەرهێنانی سەرمایەی مرۆڤی :

وەبەرهێنان لەسەرمایەی مرۆڤدا بۆی هەیە ببێتە چاکترکردنی هەڵسوڕاندنی کارگێڕی بەرهەمی هێزی کارگەر، دەتوانێ هەمان کاریگەری

یاخود زیاتریش ببینێ ئەگەر ژمارەیەکی تری زۆرتری ئاسایی تاکەکان بەکار بهێنرێن لە کرداری بەرهەمهێناندا.

فێرکردن و مەشق پێدانی تاکەکان بۆ کارامەیی و شارەزایی دەبێتە هۆی زیاتر کردنی لێهاتوویی تاکەکەس بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ وەبەرهێنانە راستەوخۆکان لە ئامرازو ئامێرەکان و شێوەکانی لەوجۆرە، هەروەها مەشق پێدانی مامۆستاو وانەبێژە بەتواناکان لەگەڵ بوونی سەرچاوە و کتێبی جۆراوجۆری ئابووری بۆی هەیە کاریگەری گەورەیان هەبێ لە چۆنایەتی و رابەرایەتی تاکەکان بۆ هاویەشیکردن لەزیادکردنی بەرهەمهێناندا، وەبەرهێنان لە دەرامەتە مرۆییەکان و رەخساندنی سەرمایەکی مرۆیی لێهاتوو هەمان کاریگەری هەیە وەك زیادکردنی چۆنایەتی و بەرهەمداری دەرامەتە رەخساوەکان (ئاودانی زەوییەکان و بەکارهێنانی دەرمانی لەناوبردنی مێروو)، بەڵام ئەو خاسیەتە گرنگەی کە ناتوانری وازی لێ بهێنری و پەیوەندی بەدەست نیشانکردن لەنێوان دوو شتدا هەیە (واتە لەنێوان بەکاربردن لە ئێستاو بەکاربردن لە ئاییندە)، کورتەکەشی واز هێنانە لە شتێك کە (وەبەرهێنان) زیاد دەکات بۆ ئەوەی لە ئاییندەدا بەرهەمی زیاتر گلّ بداتەوە.

وەبەرهێنان لەسەرمایەی مرۆڤیدا پێویستیەکی حەتمییە بۆ ئەو وڵاتە دواکەوتووانەی کە ئابوورییەکانیان ئاراستەی پەرەپێدانێکی ئامانج بۆ دارێژراو دەکەن.

### ٣. رەگەزی تەکنەلۆژیا:

پێشکەوتنی تەکنەلۆژی بەگرنگترین ئەو هۆکارانە دادەنرێت کە پەرەپێدانی ئابووری پێ دەبوژێتەوەو چەندایەتی بەرهەمی پێ زیاد دەکری ،

به ولتایەکی تر پێشکەوتنی تەکنەلۆژی یارمەتی بەکارهێنانی رێگاو ئامرازە نوێیەکان و ئابوورییەکان دەدات بۆ راپەڕاندنی پرۆژە سوودبەخشەکانی پەرەپێدان. کەواتە پێشکەوتنی تەکنەلۆژی دەتوانری وا بەکار بهێنری کە بەرهەمداری پێ بەرزبکرێتەوە لە پیشەسازییە بەکارهاتووەکان لە ولاتە دواکەوتووەکاندا.

بیردۆزەکانی پەرەپێدان و پەرەسەندنی ئابووری:

هزری کلاسیکی (ئابووری کۆن) لەسەر بنەڕەتی سیستەمی ئابووری لیبرالی وەستاوە، کە تیایدا موڵکایەتی تایبەتی تاکەکان و، بازاڕی رکابەرایەتی ئازادو، بوونی حاڵەتی بەکارخستنی تەواوی دەرامەتەکان خۆی دەسەپێنێت، ئەم هزرە (بیرە) کلاسیکیەش بڵاوبوونەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی لەکاتی شۆڕشی پیشەسازی لە ئەورووپادا لەبارودۆخێکدا کە سەپاندنی ئەم هزرەی تێدا هاتەدیو شانبەشانی ئەم گۆڕانکاریانە دەڕۆیشت کە لەگەڵ واقعی ئابووری ئەوێ دا روویاندا.

پاش شۆڕشی پیشەسازی ، هزری کلاسیکی رووی کردە دۆزینەوەی هۆکارە شاراوەکانی پشتەوەی پەرەسەندن بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لە داهاتی نەتەوەیی، لەهەمان کاتدا شیکردنەوەی کەرتی (بەشی) ئابووریشیان لەبەرچاو گرت، چونکە شیکردنەوەی داهات لەسەر ئاستی داهاتی هەموەکی یان فەرامۆش کردبوو، کلاسیکەکان باوەڕیان بە دابەشکردنی رێژەیی داهات هەیە بۆ (کرێ و موڵکانەو سوو) چونکە کاریگەری گرنگی هەیە لەسەر کرداری پەرەسەندن، بەهەمان شێوەش بەرهەمهێنانی نەتەوەیی دابەش دەبێت لەنێوان بەرهەمهێنانی پیشەسازی و کشتوکاڵیی، گرنگیدانی

کلاسیکەکان (ئابووریناسە کۆنەکان) جەخت لەسەر شیکردنەوە ئابوورییەکان دەکەن کە پەیوەندی هەیە پاڵپێوەنانی ڕەوڕەوی ئابوری بەرەو پەرەسەندن.

لــە زاناکــانی قوتابخانــەی کلاســیکی کــە گرنگیــان بەبابــەتی بەرەوپەرەسەندن داوە لە ڕێگای توێژینەوەکانیان، ئەمانەن:

١. ئادەم سمث:

(سمث) پێیوایە کە پەرەسەندن بەشێوەیەکی کەڵەکە سەندوو دێتەدی لەمیانەی پسپۆڕیوون و کاردابەش کردنەوە، کە بەهۆیەوە دەتوانری داهێنان و بەرهەمداری کرێکار لە ئابووری دا بەگشتی زیاد بکرێ، بۆ ئــەوەی ئەمــەش بێتە دی پێویستە چەند مەرجێك برەخسێنرێت وەك سەرمایە و بازاڕ.

فراوانکردنی پێکهێنانی سەرمایەش کارێکی پێویستە بۆ ئەوەی دەرگا والآ بکات لە بەردەم پسپۆڕیوون و کار دابەشکردن، جا بۆ ئەوەی سەرمایەش پێك بێت پێویسـت دەکات کـە پاشـەکەوتکردن رووەو وەبـەرهێنان ئاراسـتە بکـرێ کـە ئەمــەش خـۆی لـەخۆی دا دەبێتـە زیـادکردنی بەرهـەم و داهـات و ئاڵوگۆڕ، پاشانیش زیادبوونی پاشەکەوت و پێکهێنانی سەرمایە.

بــازاڕیش بــەلای (سمــث)ەوە کــارێکی هاوشــانی پســپۆڕیوون و کاردابەشکردنە، چونکە قەبارەی بازاڕ رێگا خۆش دەکات بۆ زیادکردنی پلەی پسپۆڕسازی و کاردابەش کردنەوە لەرێگای زیادکردنی بەرهەم و فرلوانکردنـی گۆڕینەوە لەسەر هەردوو ئاستی ناوخۆیی و جیهانی دا.

### ٢. دیڤید ڕیکاردۆ:

(ڕیکـاردۆ) کشـتوکاڵ بـە کەرتـە پێشـەنگەکانی ئـابووری نەتـەوەیی دادەنێت، چونکە دەبێتە هۆی رەخساندنی ئاسایشی خۆراك بۆ دانیشتوان، کشتوکاڵیش بەلای (ریکاردۆ) دەچێتە ژێر باری یاسای سوود داکشان کە کـار دەکاتە سەر ڕێژەی بەرهەم و سوو.

(ریکاردۆ) کرداری پەرەسەندن شی دەکاتەوە لـە ڕێگـای دابەشـکردنی کۆمەڵگە بۆ سێ کۆمەڵەی سەرەکی و ئەو پەیوەندیەی کە دروست دەبـێ لـە ئـەنجامی دابەشـبوونی ڕێـژەیی داهـات بەسـەر ئـەم کۆمەڵانـە کـە خـۆی لـە (سەرمایەدارەکان و کارکەران و خاوەن زەوییەکان) دەبینێتەوە.

لەژێر رۆشنایی ئەم دابەشبوونەدا،(ریکاردۆ) لەدابەشـکردنی داهـات بـۆ بەشـە سـەرەکیەکان دەکۆڵێتـەوە کـە ئـەویش ئـەو دەسـهاتانەیە کـە ئـەم کۆمەڵانـە بەدەسـتی دێـنن، وئـەم گەشەسـەندنەش کـە لـە هـەر یەکێکیانـدا ڕوودەدات ئـــەوا دەستنیشـــانی کـــرداری پەرەســـەندنەکە دەکـــات، ئـــەم دەسهاتانەش بریتین لەو (کرێیانـەی کـە دەدرێـن بەکارکـەران و موڵکانـە کـە خاوەن زەویەکان وەری دەگرن و، ئەو سووەی کـە سـەرمایەداران دەسـتیان دەکەوێ) بەهۆی هاوبەشی کردنیان لە پارەدارکردنی کرداری بەرهەمهێناندا.

موڵکانەو سوو بەشێوەیەکی سەرەکی بە دەسهاتی پوخت دادەنـرێن و سەرچـاوەیەکی گـرنگن لـە کـرداری پێکهێنـانی سـەرمایەدا کـە هاوبەشـە لـە کرداری پەرەسەندن دا، هۆیەکەشـی ئەوەیـە کـە ئـەم شـێوازە هـەر بەتـەنها توانای پاشەکەوت کردنی هەیە لـەڕێگای دووبـارە وەبەرهێنانـەوەی سـوو بـە ئامـــانجی بەدەســـتهێنانی زۆرتـــرین بـــڕی ســـوو، ســـوو لـــەڕێگای کـــرداری ڕکابەرایەتی دا ڕووەو کەمبووەنەوە دەچێ و لەوانەیە ئابووریش ڕووەو

وەستاوی بچیٚ بەهۆی نزمبوونەوەی بەشە ڕیٚژەیی سوو و زیادبوونی بەشە ڕیٚژەیی هەریەك لە مولَکانەو کرێی داهات.

### ٣. جۆزیٚف شۆمپیٚتەر:

بیردۆزەکەی (شۆمپیٚتەر) لە پەرەپیٚدانی ئابووریدا بەشیٚوەیەکی سەرەکی پشت بە رۆڵی (ڕیٚکخەر) دەبەستیٚ کە دەتوانی ببیٚتە پاڵنەری ڕەوڕەوەی پەرەسەندن بۆ پیٚشەوە لەڕیٚگای نویٚکردنەوە، نویٚکردنەوەش بەلای ئەم ئابووریناسەوە بریتییە لە:

١. هیٚنانەناوەوەی جۆری تازەی شمەك.
٢. هیٚنانەناوەوەی شیٚوازی تازە بۆ بەرهەمهیٚنان.
٣. کردنەوەی بازاڕی تازە بۆ ساغکردنەوەی شمەکەکان.
٤. کردنەوەی سەرچاوەی تازە بۆ کەرەستە سەرەتاییەکان.
٥. ڕەخساندنی قۆرخکاری (مۆنۆپۆل) یان شکاندنی ئەو قۆرخکارییەی کە دەستی گرتبوو بەسەر بازاڕدا.

بەپیٚی ئەم بیردۆزە، (ڕیٚکخەر کەسیٚکی بەرچاو و ڕاهاتوو نییەو ئامانجیشی بەدەست خستنی قازانج نییە، بەڵکو پاڵنەری دەروونی دیاری کراوی هەیە وەك خۆتەرخانکردنی بۆ رکابەرایەتی و حەز لە داهیٚنان و، کار دەکات بۆ سەرکەوتن نەك بۆ ئەوەی لەبەرهەمی ئەو سەرکەوتنە بخوات، بەڵکو سەرکەوتن هەر بەتەنها بۆ خۆی).

کرداری پەرەپیٚدان لای شۆمپیٚتەر لەشیٚوەی شەپۆڵی ناریٚك و پیٚك ڕوودەدات، چونکە ئابووری سەرمایەداری تووشی بارگۆڕانی ئابووری دەبیٚت کە هەندی کات لە برەوسەندن دایە هەندیٚ کاتی تریش وەستاوی و بیٚ

بازاڕی ئابووری بەدواوە دێت، هاوکات ئەم شەپۆلانە داهێنانی تازەی لەتەکدایە بەرەو بوژانەوە و برەوسەندن کە ئەمەش خۆی لەخۆی دا دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی داهاتی نەتەوەیی و تاکەکەسی.

بیردۆزی شۆمپێتەر پشت بە کۆمەڵە ئەگەرێك دەبەستێت، گرنگترینییان:

١. بوونی کێبرکێیەکی تەواو.
٢. باری بەکارخستنی تەواوەتی.
٣. کرداری پارەدارکردنی پەرەسەندن لەرێگای پشتگیری بانکەکانەوە.

## پەرەپێدانی هەرلەخۆوە (التنمیە التلقائیە):

ئادەم سمث کە یەکێکە لە زانایانی قوتابخانەی کلاسیك بە پێشەنگی ئەوانە دادەنرێت کە بانگهێشتی (پەرەپێدانی هەر لەخۆوە) دەکەن ئەویش لەژێر رۆشنایی دەست وەرنەدانی دەوڵەت لە چالاکییە ئابوورییەکان، پەرەپێدانی ئابووریش بەپێی رای (سمث) کاتێ روودەدات کە ئەگەر تاکەکان کاری ئابووری ئازادیان بۆ برەخسێ، جا لەبەر ئەوەی تاکەکان بەشێوەیەکی ژیرانە رەفتار دەکەن و لەرێگای جموجۆڵە ئابوورییەکانیشیان تا بکرێ هەوڵی بەدیهێنانی ئەوپەری قازانج دەدەن بە کەمترین تێچوون کەبەشێوەیەکی هەرلەخۆوە بێتە دی، وەك ئەوەی کە دەستێکی شارلوە هەبێ لە پاڵنانی رەورەوەی ئابوورییەکە بۆ خولانەوە تا بەم شێوەیە گەیشتووە، ئەم بەرژەوەندییە کەسێتییەش لەیەك کاتدا لەگەڵ ئەو بەرژەوەندییە گشتییەدا دێتە دی کە دەوڵەت هەوڵی هێنانەدی بۆ دەدات.

بیرۆکــەی (دەســتی شــاراوە) بــرەوی پــێ درا لــە لایــەن گــەورە سیاســتمەداران و بیرمەنــدەکان بــە تایبــەتی لــەنیوەی دووەمــی ســەدەی هەژدەهــەم لــە ئــەوروپا، ســەرکەوتنێکی بەرچاویشــی بەدەســت هێنــا لەگەشەپێدان و بووژانــەوەی سیســتەمی ســەرمایەداری ، وبــەردەوامیش بــوو تــاکو قەیرانــە ئابووریەکــەی مــاوەی نێــوان ١٩٢٩ – ١٩٣٢ ودەرکــەوتنی بیروبۆچوونەکانی ئابووریناس (کینـز) کـە دلوای دەسـت خسـتنە نـاوەوەی دەوڵــەتی دەکــرد لــەپاڵ دەستپێشــخەری تاکەکەســی بــۆ بــەردەوامی پەرەسەندنی ئابووری .

پەرەپێدانی هەرلەخۆوە لـە ئابوورییـە دواکەوتوەکانـدا قورسـە ئەگـەر مەحاڵیش نەبێت بەهۆی ئەو کۆسپە ئابووری و کۆمەلایەتی و رامیاریانەی کـە پێشتر ئاماژەمان پێی کـرد، بـەلام پەرەپێـدانی هـەر لـە خـۆوە گونجـاوە بـۆ ئابووریە پێشکەوتوەکان بەهۆی چەند هۆکارێك کە پەیوەندیان بە سیستەمی رامیاری وئابووری وکۆمەلایەتیەوە هەیە کە گـەلانی ئـەم ناوچـە جوگرافیـەی جیهان هەیانە.

**پلاندانانی ئابووری** Economic Planning

**چەمکی پلاندانانی ئابووری:**

بەگشتی جیاوازی هەیـە لـە ڕا وبۆچـوونەکان دەربـارەی پێناسـەیەکی ووردی پلاندانان،چـونکە ئابووریناســانی پەرەپێـدان وپلانــدانان پەنادەبەنــە بــەر پێـوەری جـۆرا وجـۆر بـۆ شـیکردنەوەی پلانـدانان بـەهۆی هەنـدێ کـاری پەیوەستە بـە ئامـانج لـە بـەکارهێنانی ڕێگـای پلانـدانان و سیسـتەمی بـاوی ئابووری لە ولاتەکەدا،هەندێ لەوانە پلاندانانی ئـابووری بـەم شێوەیەپێناسـە دەکەن:

(شێوازێکی زانستییە کە بە هۆیەوە دەوڵەت دەست لە چالاکی ئابووری وەردەدات بە ئامانجی خستنەگەڕ و رەخساندنی دەرامەتی مرۆڤی و دارایی و ماددی لە پێناو راپەراندنی برێکی دیاریکراو لە وەبەرهێنانە بەرهەمدارەکان و ئاراستەکردنیان بۆ هێنانەدی خێراترین پەرەسەندنی ئابووری لە داهاتی نەتەوەیی) .

ئەمەش لە سەر بنەمای هێنانەدی هاوسەنگی وگونجاندن لە نێوان بەرهەم وپێداویستی وپاشانیش بەکاربردن کە لە کۆتاییدا دەبنە هۆی زیاد بوونی ناوەندی داهاتی تاکە کەس و رووبەڕووبونەوەی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان بە پێی سیستەمی بژاردە لە کارە هەرە پێشەکاندا.

## مەرجەکانی پلاندانانی ئابووری:

پلاندانانی ئابووری پێویستە لە سەر کۆمەڵێك بنەماو بیروباوەڕ و مەرج دابنرێ کە دەتوانرێ لە مانە کورت بکرێنەوە:

### ١-سەرتاپاگیری (سەرتاسەری):

پێویستە پلانی ئابووری سەرتاپاگیر و بەیەکەوە بەستراو بێت، بە لە بەر چاوگرتنی چالاکییە ئابوورییەکان لە کەرتەکانی تردا، چونکە هەر چالاکییەك لەم چالاکییانە کاریگەری راستەوخۆی هەیە لە سەر چالاکییەکانی تردا، بەمەش پلانی ئابووری سەرکەوتن مسۆگەر ناکات، ئەگەر شێوازی سەرتاپاگیری لە لێکدانەوەکانی خۆیدا نەگرێتەبەر، چونکە بەمانا فراوانەکەی رێگای نموونەیی دەنوێنێ لە ئاراستەکردنی ئابووری هەمووەکیدا.

٢- ڕیالیزمی (واقیع بینی):

پێویستە پلانی ئابووری لەگەڵ واقعی ئابووری دەوڵەتدا بگونجێ بە شێوەیەك کە ئامانج و هیوا خواستراوەکانی پلانەکە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو واقیعەی کە هەیە، لە هەمانکاتدا توانا بەرجەستەکراوەکان و ئەو کۆسپانەش کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم جێبەجێکردنی پلانەکەدا لە بەر چاو بگیرێن.

٣-هەماهەنگی (گونجاندن):

پلانی ئابووری پێویستی بە سەرەتای هەماهەنگی(گونجاندن)هەیە لە سەر ئاستی ئامانجەکانی پلانەکە و ئەو شێوازانەی کە پێویستن بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانە، پێویستە هیچ دژە بۆچوونێك نەبێ لەنێوان ئامانجەکان هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تردا، لە هەمانکاتدا لەگەڵ شێوازەکانیش، وسەبارەت بەئامانجەکان و شێوازە جۆراوجۆرەکانی هێنانەدی ئەم ئامانجەش هەر بەم جۆرەیە، بۆیە هەماهەنگی(گونجاندن) بە بڕبڕەی پشتی پلان دادەنرێت وبە ئاسانی جێبەجێکردنیشی هەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، بێ ئەوەی کۆسپ و تەگەرەی بێتە پێش.

٤-مەرکەزیەتی پلاندانان و نا مەرکەزیەتی جێبەجێکردنی:

مەرکەزیەتی پلاندانان واتا بوونی دەزگایەکی ناوەندی کە هەڵسێ بە دەرکردنی بڕیارە بنەڕەتییەکان بۆ دانانی پلانەکە، و ئەم بڕیارانەش پەیوەستن بە شێوازی بەکارهێنانی دەرامەتە ڕەخساوەکان (بەردەستەکان) وگونجاندنیان و کاریگەرییان لە گۆڕانە ئابوورییەکان بە هەماهەنگی لەنێوان پلانە جۆریەجۆرەکانی یەکە بەرهەمهێنەکان، بەڵام نامەرکەزی جێبەجێکردن واتا دەسەڵاتی مەرکەزیش تا ڕادەیەکەکی زۆر بوار دەڕەخسێنێ بۆ یەکە بەرهەمهێنەکان کە بە سەربەستانە بەشداری بکەن لە داڕشتن و

جێبەجێکردنی پلاندانەکەدا، بڕیاری ستراتیژی بۆ دەسەڵاتی دەزگای مەرکەزی دەگەڕێتەوە، چونکە خاوەنی ئەو کادیرە تەکنیکیانەن کە شارەزاییەکی تەواویان لەمەڕ بارودۆخی ئابووری نەتەوەیی و پێویستییەکانی پلانەکەدا هەیە.

٥-نەرمی نواندن لە پلاندا:

پلانی ئابووری پێویستە نەرم و نیانی تیا بنوێنرێ بۆ ئەوەی بتوانی ئامانجە دەستنیشان کراوەکان بێنێتە دی و بواریش بڕەخسێنێ بۆ سەرپەرشتیارانی پلاندانانەکە بۆ ئەوەی بەدەم گۆڕانکارییە لە ناکاوەکانەوە بچن کە لەوانەیە لەکاتی جێبەجێکردنی پلانەکەدا روو بدات و لەوانەیە ببێتە بەربەست لەبەردەم جێبەجێ نەکردنی بەباشترین شێوە.

بۆ نموونە لەکاتی روودانی کارەساتە سروشتی و جەنگە کتوپڕەکاندا ئیتر دەرامەتە پێویستیەکانی پلانەکە لەکورتی دەدەن(کەم دەبنەوە)، هەر بۆیە وا چاکە پلانی ساڵانە دابڕێژرێت کە بەهۆیەوە دەتوانرێ ئەو گۆڕانکاری و دەستکاری کردنانەی کە پێویستن ئەنجام بدرێن بۆ ئەوەی پلانەکە هاوشانی ئەم بارودۆخە نائاساییە بڕوات و لەگەڵیدا بگونجێت.

٦- پابەندبوون:

پابەندبوون یەکێکە لە نیشانە سەرەکیەکانی پلاندانان، بۆ دڵنیابوونیش لەسەرکەوتنی پلانی ئابووریدا پێویستە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە(بێ جیاوازی) پابەند بن بە سەرەتاکانی پلان و هاوکاری و بەشداریکردن لە کرداری سەرخستنیدا، چونکە ئامانجەکەی هێنانە دی ئامانجەکانی بەرژەوەندی گشتییە.

٧-بەردەوامیەتی:

کاتێ پلانی ئابووری دەچێتە قالبی جێبەجێکردنەوە پێویستی بە بەدواداچوون و توێژینەوەی بۆ بکرێ بۆ دڵنیابوون لە بوونی ئەو مەرجانەی کە پێویستن بۆ لەکارنەکەوتن و نەپچڕانی بەردەوامییەکەی تا دەگاتە ئەو ئامانجەی کە بڕیاری بۆ دراوە، چونکە پلان پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە فاکتەری کات هەیە، جا بۆیە پلانە ماوە درێژخایەنەکان پێویستیان بە پلانی تەواوکەری ماوەکورت خایەن و ماوە مام ناوەند هەیە بۆ مسۆگەر بوون و دڵنیابوون لە نەرم نواندنی پلانەکە، بەمەش دەتوانرێ بەدواداچوون بۆ چۆنێتی بەڕێوەچوونی پلانەکەو کۆمەك کردنی بەو دەرامەتانەی کە لێ براوە.

٨-بەدواداچوون:

ئەو دەسەڵاتدارانەی کە سەرپەرشتی پلانی ئابووری دەکەن پێویستە لەسەریان دەستوورێك دابڕێژن بۆ ئەوەی لەوە دڵنیابن کە ئەم پلانە بەپێی ئەو ڕێسایانەی کە نەخشەی بۆ کێشراوە دەڕوات بەڕێوە، پاشانیش بۆ هەڵوەستەکردن لەوەی تا چەند ئامانجە خوازراوەکان و ئەوانەشی کە هەوڵی هێنانەدی بۆ دەدرێت هاتونەتە دی. ئەم بەدواداچوونەش بەدرێژایی ماوەی تێپەڕبوونی پلانە ئابوورییەکە بەردەوام دەبێت.

ئامانجەکانی پلاندانانی ئابووری:

لەگەڵ دەست پێکردن بە دارشتنی پلان پێویست دەکات ئەو ئامانجانەش دەست نیشان بکرێن کە پلانەکەی لەپێناودا دادەڕێژرێت کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئامانجە هەرە گرنگەکان لەپێشەوە دادەنێ و

پاشانیش ئامانجی ئابووری تر بەهەمان ڕێچکە بەدوایەوە دێن، لەوانەشە بایەخەکە **(بۆ زیادکردنی داهاتی نەتەوەیی و هێنانەدی یەکسانی بێت لە دابەشکردنی بەسەر ئەندامانی کۆمەڵگەدا، یاخود نزمکردنەوەی بێکاری بۆ ڕێژەیەکی شیاو لەگەڵ پارێزگاری لە سەقامگیری ئاستی گشتی نرخ لە وڵاتدا).**

پاش دەستنیشانکردنی ئامانجەکان بەپێی ئەو ڕێچکەیەی پلانەکەی بۆ داڕێژراوە، ئیتر داڕشتنی ئامانجە ئابوورییەکانی کە بریتین لە ڕادەی پەرەسەندنی ئارەزوومەندانەو پێشتر ئامادەکراو لە لایەن ئەنجومەنی پلاندانانەوە دەست پێ دەکات، جا ئەگەر ڕای شارەزایانی بریتی بێت لە زیادکردنی ناوەندی داهاتی تاکەکەس وەک ئامانجێکی پێشووتر، ئەوا بێگومان دەبێ داڕشتنی بڕی پەرەسەندنی بەدواوە بێت، لەوانەشە ساڵانە ٣٪ بێت (وەک نموونە).

ئامانجەکانیش ڕۆڵی ستراتیژییان هەیە، چونکە بەو ڕێگایەوە ئامرازەکانی ڕامیاری ئابووری دەست نیشان دەکرێت (جا نەختینەیی یان دارایی بێت) لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە، هەروەها دەرامەتی پێویستیش تەرخان دەکرێت بۆ گەیشتن بە ئامانجە پلان بۆ داڕێژراوەکان.

**قۆناغەکانی جێبەجێ کردنی پلان:**

هەروەک روون و ئاشکرایە کە ئامانجی سەرەکی پلاندانانی ئابووری بریتییە لە گواستنەوەی جۆراوجۆرێتی ئابوورییەوە لەوبارەی کە ئێستا تیایدایە بۆ بارێکی ئابووری زیاتر فرەهاتی (خۆشگوزەرانیی) بەسترلو بەو ئامانجانەی کە لە کۆتایی ماوەی پلانەکەدا دێنەدی.

لــە گــرنگترین ئــەو هۆكارانــەش كــە بەتــەواوەتی كاریگــەریان هەیــە لــە جێبــەجێكردنی پلانــدا: (**هۆكــارە دەرەكیــەكان وەك شــەڕو جــەنگ و كارەساتە سروشتییەكان، وهۆكارە ناوخۆییەكان وەك قورس وگرانی هەڵبــژاردنی شــێوازەكان و بەســتنەوەیان بــە جۆراوجــۆرێتی ئامانجەكان، لەگەڵ بوونی ڕەهەندی كاتی پێویست بۆ تەواوكردنی پلانەكە**).

**كۆكردنەوەی زانیارییەكان:**

ئەنجومەنی پلاندانان ستراتیژیەتێكی تایبەتی هەیە بۆ ئامادەكردنی پــلان كــە هــەر لــەژێر ڕۆشــنایی ئەوەشــەوە پلانەكــە دەچــێتە قــاڵبی جێبەجێكردنــەوە، جــا لــەكۆی ئــەو ســتراتیژیانەو بــۆ جێبــەجێكردنی پلانــی ئابووری بەباشترین شێوە ئەوەیە كە: لەسەر ئەنجومەنی پلاندانانەكە لەرووی مەیدانییــەوە هەڵســێ بــە پێوانــەكردنی دەرامەتــە ڕەخســاوەكانی وڵات و، پێشكەشــكردنی ئــەو لێكۆڵینــەوەو توێژینەوانــەی كــە بنــەما زانســتییەكان دەڕەخسێنن بۆ بڕیارەكانی ئەنجومــەنی پلانــدانان، یــەكێ لــەو كارانــەش كــە دەكەوێتــە ئەســتۆی ئەنجوومــەنی پلانــدانان(یــاخود دەســتەی پلاندانان) بریتییە لە ئامادەكردنی ئــەو ڕوونكردنەوانــەی كــە واقعــی ئــابووری دەگرێتە خۆی لــەڕووی دابەشــبوونی دیمــۆگرافی و هێــزی كاركــەر و بەرهــەم و داهات و گۆڕانكارییە ئابوورییە هەمووەكییــەكانی تــر، ئــەم ڕوونكردنەوانــەش لەوپــەڕی گرنگیــدان، چــونكە ســەركەوتنی پلانەكــە لەســەر ڕادەی ڕاســت و دروستی ئەو ڕوونكردنەوانە وەستاوە.

ئەمە جگە لەوەی کە ئەنجومەنی پلاندانان ستراتیژیەتێکی تایبەتی پیادە دەکات بۆ ئامادەکردنی پلانەکە بۆ ئەوەی بچێتە قالبی جێبەجێکردنەوە، جا لە کۆی گرنگترین ئەم ستراتیژیانە:

ستراتیژییەکانی پلاندانان:

١-دارشتنی ئامانج:

دوای ئەوەی لەرووی مەیدانییەوە پێوانەیەکی وردی دەرامەتە ئابوورییەکانی نەتەوەیی کرا، ئیتر ئەنجومەنی پلاندانان لەژێر رۆشنایی ستراتیژیەتی پەرەپێدانی مەودا دووردا ئامانجە ئابوورییە هەمووەکییەکان دەستنیشان دەکات بەلەبەرچاوگرتنی نەبوونی دژە بۆچوونی ئامانجەکانی هەندێکیان بەهەندێکی تریانەوە، جا بۆ نموونە سەقامگیری ئاستی گشتی نرخ لەوانەیە یەك نەگرێتەوە لەگەڵ ئامانجی ئاستێکی نزمی بێکاری، پاش لێکۆڵینەوەی ئەگەرەکان ئیتر ئەنجومەنی پلاندانان ستراتیژیەکەی خۆی دەخاتە بەردەم دەسەلاتدارانی بالا بە مەبەستی لێکۆڵینەوەو چەسپاندنی پلانەکە.

٢- لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی چوارچێوەی دەستپێکی (سەرەتایی) پلان:

پاش دەستنیشانکردنی ئامانجە سەرەتایی و یەکەمینەکان لەلایەن دەسەلاتدارانی بالاوە، ئیتر ئەنجومەنی پلاندانان هەڵدەستێ بە قالب گرتنی ئامانجەکان ئەویش لەرێگای وەرگێرانی بۆ نیشانە ماددیەکان کە هەر لەسەر ئەم بنەرەتەوە کاروانی ئابووری بەرەو پەرەسەندن دەبات.

نیشانە ئابوورییەکانیش لەم قۆناغەدا زیاتر روون وئاشکراترن، بۆ نموونە زیادکردنی داهاتی نەتەوە پێویستی بە پەرەسەندنی پێکهێنەرەکانیەوە هەیە

کە بریتین لە زیادکردنی شمەك بەهەموو شێوکانی و کارگوزاریش بەهەموو جۆرەکانی ، پاش دەستنیشانکردنی ئامانجە دەستپێکە ماددیەکان ئیتر ئەنجومەنی پلاندانانیش هەڵدەستێ بە دارشتنی ئامانجەکانی بەرهەمهێنان و وەبەرهێنان بۆ پیشەسازییە پێشەنگەکان لە ئابووریدا.

ئامانجە دەستپێکە ماددیەکان سیمایەکی ئاراستەکراوی هەیە کە لەسەری دەڕوات، ولەوانەیە وا پێویست بکات کە نیشانە ئابوورییەکان دەستکاری بکرێن کە خۆی لەخۆیدا بەستراوە بە ڕادەی دەنگەوەهاتنی تواناو هێزە ڕەخساوەکان لە ئابووری دا وەك پێویستییەکانی پلاندانان.

٣- گفتوگۆکردنی پلان:

دوای تەواوبوونی دەسپێکی پلانەکە، ئیتر دەستەی ناوەندی پلاندانان پلانەکە دەخاتە بەردەم ئاستی وەزارەتەکانەوە بەمەبەستی گفتوگۆکردن وپیشاندانی تێبینییەکان بەشێوەی نووسراو، ئەم تێبینیانەش یارمەتیدەرن بۆ دەرخستنی پلانەکە بۆ ئەوەی زیاتر روونتر بێت لەسەر ئاستی کەرتی پەیوەندیدار، ئەم کردارەش لەیەك کاتدا لەسەر ئاستی وەزارەتەکانەوە بۆ ئاستەکانی پرۆژەکانی بەرهەمهێنانی هەر کەرتێك بەڕێوە دەچێ.

لەلایەن خۆیانەوە پرۆژەکانی بەرهەمهێنان ڕای خۆیان بەشێوەیەکی روونتر دەربارەی پلانەکە ودەربارەی هەموو پێویستییە دارایی و دەرامەتەکان و سەرچاوەکانیان دەردەبڕن، ئەمە جگە لە دانانی بازاڕی ناوخۆ و دەرەکی لەلایەنی خواستەوە لەسەر بەرووبوومە دروستکراوەکان. پلانی ئابووری لەپاڵ دەستکاری و پێشنیارەکان جارێکی تر ڕێگا دەگرێتە بەر لە ئاستی پرۆژەکانەوە بۆ کەرتە پەیوەندیدارەکان و لەوێشەوە بۆ وەزارەتە پسپۆڕکارەکان بۆ ئەوەی ئەویش لەلایەن خۆیەوە جارێکی تر بگاتەوە

دەستەی پلاندانانی ناوەندی کە ئەمەش هەڵدەستێ بە کرداری هەماهەنگی لەنێوان ئامانجە جۆرلوجۆرەکانی کەرتەکان و پاشانیش دارشتنی پلانەکە بەتەواوەتی لەهەموو لایەنێکەوە.

٤-قۆناغی جێبەجێکردنی پلان:

دوای ئەوەی کە پلانی ئابوورییەکە تەواو کرلو ئامادەبوو بۆ جێبەجێکردن، ئیتر دەستەی پلاندانانی ناوەندی هەڵدەستێ بەبەرزکردنەوەی دۆسیەی(فایلی) پلانەکە بۆ سەرکردایەتی ڕامیاری دوای بەدەستهێنانی ڕەزامەندی، ئیتر پلانەکە دەخرێتە بەردەم دەسەڵاتی یاسادانان بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەسەر بکری ، پاشانیش یاسایەکی بۆ دەردەکات(یاسای پلان) بۆ ئەوەی ئامادەبێت بۆ جێبەجێکردن.

## شێوازەکانی پلاندانان وگرنگییەکەی:

بۆ جێبەجێکردنی پلانی ئابووری تا بکرێ بە کەمترین تێچوون و لەچوارچێوەی ماوەو کاتێکی دیاریکراودا، شارەزایانی پلاندانان پەنایان بردە بەر پیادەکردنی شێوازەکانی چەندایەتی بۆ نەخشەکێشانی باشترین ڕێگا تا بەهۆیەوە بگەنە هێنانەدی ئامانجە ئاوات خوازراوەکان بە لەبەرچاوگرتنی هاوسەنگی گشتی ئابووری ، وە لە گرنگترین ئەم شێوازانەش:

١-حیسابە نەتەوەییەکان.

٢-بوجە ئابوورییەکان.

٣-نموونە ئابوورییەکان .

## پرسیارەکانی بەشی چوارەم

١. دواکەوتوونی ئابووری چییە؟

٢. Todaro چۆن پێناسەی دواکەوتوویی دەکات؟

٣. خاسیەتەکانی دواکەوتویی ئابووری چین؟

٤. چۆن دەتوانرێت کەمی سەرمایە شی بکەینەوە؟

٥. باس لە بازنە بەتاڵەکان بکە بۆ کەمی سەرمایە.

٦. بۆچی پاشەکەوتکردن دەبێتە قەیران لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا ؟

٧. هۆکارەکانی زۆربوونی دانیشتوان چین لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا ؟

٨. خاسیەتە دیارەکانی کەرتی کشتوکاڵ چین لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا ؟

٩. دیاردەی زیادبوونی خەرجی گشتی چین ؟ ئایا ئەم دیاردەیە کاریگەریەکی خراپی لە سەر ئابووری لە لە وڵاتە دواکەوتووەکاندا هەیە ؟

١٠. بێکاری دیار ( ئاشکرا ) Open Unemployment چییە ؟

١١. جیاوازی چییە لە نێوان پەرەسەندنی ئابووری و پەرەپێدانی ئابووری ؟

١٢. پێویستییەکانی پەرەپێدانی ئابووری باس بکە .

١٣. نوێبوونەوە چییە ؟

١٤. لەسەر پەرەپێدانی هەر لەخۆوە بدوێ، و چۆن لە بیرۆکەی دەستی شاراوە گەیشتووی ؟

١٥. چۆن لە بیرۆکەی ئادەم سمث گەیشتووی بۆ پەرەسەندنی ئابووری ؟

١٦. جیاوازی چییە لەنێوان بیردۆزی ریکاردۆ و شۆمپیتەر ؟

١٧. پلاندانانی ئابووری چییە ؟

١٨. مەرجەکانی پلانی ئابووری بنووسە ، و باسی هەموویان بکە .

١٩. ئامانجی پلانی ئابووری چییە ؟

٢٠. ئەو رێگایانە چین کە بە هۆیەوە پلانی ئابووری پێ جێبەجێ دەکرێ؟

٢١. ئامانجەکانی پلاندانانی ئابووری چییە؟

# سەرچاوەكانی بەشی چوارەم


١. د. جلال محمد علي احمد ، التنمية الاقتصادية ، بغداد ، ١٩٧٨ .

٢. د. عبدالحميد القاضي ، دراسات في التنمية والتخطيط ، القاهرة ، ١٩٨٠ .

٣. د. عبدالرحمن زكي ابراهيم ، التخطيط الاقتصادي ، الاسكندرية ، ١٩٩٥ .

٤. د. عبدالغفور حسن كنعان المعماري ، نظريات و تجارب التخطيط الاقتصادي، الموصل ، ١٩٩٣ .

٥. د. عبدالمنعم السيد علي ، دور السياسة النقدية في التنمية الاقتصادية ، القاهرة، ١٩٧٥.

٦. فايز محمد علي ، قضايا التنمية و التحرر الاقتصادي في العالم الثالث ، بيروت ، ١٩٧٨ .

٧. د. فليح حسن خلف ، التنمية الاقتصادية ، بغداد ، ١٩٨٨ .

٨. د. محمد فاضل محمد عزيز قفطان ، التنمية الاقتصادية ، بغداد ، ١٩٨٤ .

٩. د. محمود عبدالفضيل ، دراسات في التخطيط ، القاهرة ، ١٩٧٣ .

١٠. د. مهدي علي الوحيد و د. هلال ادريس مجيد ، مقدمة في التنمية و التخطيط ، بغداد ، ١٩٨٨ .

١١. افريت هاجان ، اقتصاديات التنمية ، مركز الكتب الاردني ، عمان ، ١٩٨٨ .

١٢. M. P. Todaro، " Economic Development"، 7th ed.، New York، 2000.

# بەشی پێنجەم
# دارایی گشتی
# PUBLIC FINANCE

زانستی دارایی گشتی یەکێکە لە لقەکانی زانستی ئابووری کە بایەخ بە لێکۆلینەوەی چالاکیەکانی حکومەت لەبواری ئابووری و ئەو ئامرازە زۆرە جێگرەوانە دادەنرێن بۆ پارەدارکردنی خەرجییە جۆریەجۆرەکانی حکومەت، هەندێ لە زانایانی هاوچەرخی ئابووری هەوڵێکی زۆریان بۆ ئەم لقە تەرخان کردووە لە بەر گرنگیەکەی و بەمشێوەیە پێناسەیان کردووە:

**" ئەو زانستەیە کە بە چڕی تاوتوێ گۆڕانکاریەکان سەبارەت بە باجەکان و سیاسەتی بوودجەی دەوڵەت دەکات"**

ئەم شیکردنەوە ئابوورییە ئەرکەکانی حکومەت دەگرێتەوە لەهەر وڵاتێکی پێشکەوتوو بێت یان تازە پێگەیشتوو لە خۆدەگرێ وسروشتی خەرجییانەش دەگرێتەوە کە لەم چالاکیە ئابوورییە گشتییە هەمەجۆرەکان خەرجی دەکات.وئەو شێوازە زۆرانەی بە مەبەستی بە دەستهێنانی دەسهاتەکان بەکاریان دێنێ .

بۆیە لێکۆڵینەوە لە بارەی هەر زانستێك پێویستی بە پێناسەیەکی دیاریکراو هەیە کە چوارچێوە وئامانجەکانی دەست نیشان بکات، وچوارچێوە وئامانجی هەر زانستێکیش بە پێی گۆڕانی ماوە و کاتەکەی و جیاوازی نووسەرەکان دەگۆڕدرێت، هەمان شتیش لە بارەی زانستی دارایی گشتییەوە دەگوترێ، کە چوارچێوەکەی فراوانتربووە بەهۆی فراوانبوونی، رۆڵی دەوڵەت وبۆچوونی زانایانی دارایی گشتی جیاوازن لەدیارکردنی ئامانجەکان. کاری دارایی دەوڵەتی پاسەوان تەنها بریتی بوو لە بەدەست هێنانی دەسهاتی گشتی لە

پێناو خەرج کردنیان لەو سێ ئەرکەی دەوڵەت" ئاسایشی ناوەخۆ وبەرگری و دادپەروەری " ئەمەش لە شێوەی بوودجەیەکی هاوسەنگدا بێ کورت هێنان وهیچ جۆرە سەرریژییەك. زاناکانی ئەم قوتابخانەیە بانگهێشتی:

١- کەمکردنەوەی خەرجیە گشتییەکان ودوورکەوتنەوە لە زێدەخەرجی وبەفیڕۆدان .

٢- ئەو باجانەی دەسەپێنرێنەسەر تاکەکانی کۆمەڵگە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بێت.

بۆیە دەکرێ زانستی دارایی گشتی لەبەر ڕۆشنایی دەست تێوەردانی دەوڵەت لە چالاکی ئابووریدا بەمشێوەیە پێناسە بکەین: ( ئەم زانستەیە کەوا بایەخ بە چالاکی دارایی دەوڵەت دەدات لە بوارەکانی دەسهات و خەرجییە گشتییەکان و بودجەی گشتی و بەکارهێنانی رامیاری دارایی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزەرانی لە کۆمەڵگەدا).

### پەیوەندی زانستی دارایی گشتی بە زانستەکانی ترەوە:

هەموو زانستەکان بە شێوەی جیاجیا و کەم تا زۆر پەیوەندییان لە نێواندا هەیە، هەمان شتیش دەگوترێ لە بارەی دارایی گشتییەوە کە پەیوەندییەکی پتەوی بە زانستەکانی ترەوە هەیە ئەم زانستە کە لەگەڵ سەرهەڵدان و گەشەکردنی دەولەت وبەرفراوانبوونی رۆلی کاریگەری لە کۆمەلگادا سەری هەڵدا، ورۆڵی کاریگەری لە سەر کۆمەڵگە هەیە و زانستێکی کۆمەڵایەتییە و پەیوەندییەکی بەهێزی بە لقەکانی دیکەی زانیارییەوە هەیە، کە لەم خاڵانە خۆی دەنوێنێ:

### یەکەم - پەیوەندی زانستی دارایی گشتی بە زانستی ئابوورییەوە:

زانستی دارایی گشتی بەشێکە لە زانستی ئابووری، کە تایبەتمەندی خۆی هەیە بۆ ئەوەی زانستێکی تایبەت وجیاواز بێت لە لقەکانی دیکەی زانستە ئابوورییەکان.

لەگەڵ ئەوەی زانستی ئابووری (Economics) هەوڵدەدا ئەو دەرامەتە ئابوورییە سنووردارەی هەیە بە سەر پێداویستییە بێ سنوورەکانی تاکەکان تەرخانی بکات و میکانیزمی بازاڕ (چۆنیەتی خواست و خستنەڕوو) بەو پەڕی توانایەوە کاردەکات لە رێگای کەرتی تایبەت کاری بەکارهێنانی دەرامەتەکان لە بەرهەمهێنان و دابینکردنی زۆربەی شمەك وخزمەت گوزارییەکان کە بەشمەکی تایبەت ناسراوەدابینیان بکات . یان میکانزمی بازاڕ بە بەوپەڕی توانایەوە کارناکات بۆیە حکومەت دەبێت ئەم جۆرە شمەك و خزمەتگوزاریانە کە بەشمەکی گشتی ناسراون دابینیان بکات، واتە ئابووری

بەگشتی بایەخ بە پڕکردنەوەی سەرجەم پێداویستییەکان دەدات، کەچی دارایی گشتی تەنها بایەخ بە پێداویستیە گشتیەکان دەدات وە ئەگەر زانستی ئابووری بایەخ بە تەرخانکردنی دەرامەتە ئابوورییەکان بدات بۆبەکارخستنی گشتی وتایبەتی، ئەوا زانستی دارایی گشتی بایەخ بەدووبارە دابەشکردنەوەی ئەو دەرامەتانە دەدات. وئەرکەکانی دارایی گشتی بریتین لە بەدی هێنانی هەمان ئامانجەکانی ئابووری کەئەوانیش تەرخان کردنی دەرامەت بە باشترین شێوە، ودابەشکردنی داهات وسامان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە وبەدی هێنانی سەقامگیری وپەرەسەندنی ئابووری.

**دووەم - پەیوەندی زانستی دارایی گشتی بە زانستی رامیاریەوە:**

زانستە رامیاریەکان Political Sciences بایەخ بە رژێمەکانی حوکم و پەیوەندیەکانی نێوان دەسەڵاتە گشتیەکان لە ناوخۆیاندا لەلایەك و پەیوەندیان بە هاوڵاتیانەوە لەلایەکی دیکەوە دەدەن، بەڵام زانستی دارایی گشتی بایەخ دەدات بە چالاکی دارایی دەوڵەت لە بوارەکانی خەرجی ودەسهات و بوودجەدا وە بەکارهێنانی رامیاری دارایی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئابووری وکۆمەلایەتیەکان.

پەیوەندی نێوان هەردوو زانستەکە پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕکێیە، دەسهات و خەرجیە گشتیەکان و بوودجەی گشتی ئاوێنەی رەنگدانەوەی فەلسەفەی ئەو رژێمە رامیاریەن کە هەیە لە پێناوی بەدەستهێنانی ئامانجە ئابووری و کۆمەڵایەتی و رامیارییەکاندا، بۆیە قەبارەی دەسهات وخەرجییە گشتیەکان لە وڵاتانی سەرمایەداری جیاوازی هەیە لە گەڵ وڵاتانی سۆشیالستی، هەروەها جیاوازیش هەیە لە نێوان ئەو وڵاتانەی کە سەرمایەداری دیموکراتین یاخود دیکتاتۆرین، یاخود وڵاتێکی سۆشیالستی مەرکەزی یاخود نا

مەركەزییە لە بەڕێوەبردندا، كەولتە سیستەمی سیاسی كار دەكاتە سەر دارایی گشتی دەوڵەت وئەو ئەرە داراییانەی كە دەتوانێ بە دەستی بێنێ.
كردارە داراییەكان لە بەڵگەنامە ئاماریەكاندا تۆمار دەكرێن ئەم زانیاریانە بەڵگەی بەهێز دەبەخشنە زانستە سیاسییەكان، كە ڕێگە بە شیكردنەوەی بابەتیانە بۆ ناوەرۆكی سیاسەتە جۆراو جۆرەكان دەدات لە ڕوونكردنەوەی ئەم خەرجیانەی دەوڵەت خەرجی دەكات بۆ هەر چالاكییەك ، بۆ نموونە دەتوانی بڕی ئەو خەرجیانە بزانێ كە دەوڵەت بۆ بواری بەرگری یان فێركردن یان تەندروستی یان توێژینەوەی زانستی خەرجی كردووە ، هەروەها ڕێگە دەدات بە بەراووردكردنی ئاستی ئەو خەرجیانەی لە ماوەیەكەوە بۆ ماوەیەكی تر لە چوارچێوەی هەمان دەوڵەتدا، ودەتوانرێ قەرزی گشتی وەك پێوانەیەك بۆ ڕادەی متمانەكردنی هاوڵاتیان بە حكومەت بە كاربهێنرێ، ئەویش لە ڕێگەی وەرگرتنی قەرز یاخود وەرنەگرتن .
جێبەجێ كردنی هەر بڕیارێك كە دەوڵەت دەری دەكات ، پێویستی بە پارە هەیە، چونكە دەركردنی هەر بڕیارێك لە لایەن دەوڵەتەوە گەر دەرامەتی نەبێ بۆ جێبەجێكردنی ئەوا بەهاونرخێكی نابێ، بۆیە هەندێ كەس پێیان وایە كە دارایی گشتی هۆیەكی سەرەكییە بۆ سەركوتكردن كە دەسەڵاتداران دژی بێ دەسەڵاتەكان بە كاری دێنن، كە ئەم دوو دەستەیەش پێكهێنەری كۆمەڵن و بە چاو پۆشین لەو سیستەمە سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتییەی هەیەتی.
سیستەمی ڕامیاری دەكەوێتە ژێر كاریگەری دارایی گشتی، چونكە بارودۆخی دارایی كاردەكاتە سەر ڕەوشی ڕامیاری دەوڵەت ، چەندەها وڵات سەربەخۆیی سیاسیان لەدەستداوە ووچاری شۆڕش بونەتەوە بە هۆی

شپرزەیی دارایی گشتی وجێگیر نەبوونی ، واتە روودانی گرفتێکی دلرایی دەبێتە هۆی نەمان و لادانی حکومەت، بەمەش زانستی دارایی گشتی ئەو زانستەیە کە بایەخ بە دارایی دەوڵەت دەدات و زلنستی رامیاری بایەخ بەحکومەت و دەزگاکانی رامیاری دەدات .

**سێیەم- پەیوەندی زانستی دارایی گشتی بە زانستی یاساوە:**

یاسا(Law) ئامرازێکی رێکخستنە بەدەست یاسادانەرەوە بۆ رێکخستنی ژیانی کۆمەڵگە ئەمەش بەدلنانی رێساکان کە پێویستە لە هەموو بوارەکانی چالاکیە مرۆییەکاندا پابەندبن پێوەی لەوانەش بواری دارایی کەوا ئامرازەکانی دارایی گشتی لە خەرجی و داهات و بوودجەکە شێوەی رێساکانی یاسایی وەردەگرێت .

جا لە شێوەی دەستووریێت یان یاسا یاخود سیستەم یان فەرمانی کارگێڕی، ئەمەش شارەزایی لە هونەری یاسایی هەبێ بۆ تێگەیشتنی رێساکان و شیکردنەوەیان کە لەوانەیە بچێتەوە ناو یاسایەکی دیکە لە یاسا گشتی و تایبەتییەکاندا. بەم جۆرە دارایی گشتی پەیوەندیەکی پتەوی هەیە لەگەڵ یاسادا، چونکە هیچ چالاکیەکی دارایی بەبێ یاسا بوون و مانای نابێ، بۆ نموونە ناتوانرێ باج یان هەر سەرچاوەیەکی دیکەی دەسهات بە بێ یاسا بە دەست بێت، هەروەها ناتوانرێ هیچ جۆرە خەرجییەکی گشتی تەرخانبکرێ بە بێ یاسا، وهەروەها بڕیاردان لە سەر بوودجەی گشتی بە بێ یاسا نابێ.

**چوارەم - پەیوەندی زانستی دارایی گشتی بە زانستی ئامارەوە:**

زانستی ئامار (علم الأحصاء) بایەخ بە زانیاری و ڕەنووسە مەزندەکراوەکان و پێوەرەکانی روون کردنەوە دەدات زانستی ئامار (Statistics) لەم سەردەمەدا بەئامرازێك دادەنرێ کە هیچ توێژەرێك لەهەر لقێکی زانستی بێ ناتوانێ دەستبەرداری بێت.

لە بواری دارایی گشتیدا تێبینی دەکرێت کەوا خەرجی و دەسهات و بوودجەی گشتی بەر لە جێبەجێکردنیاندا تەنها مەزەندەکراون (خەملێنراون)، بەلام ئامار هەلدەستێت بە پێشکەشکردنی زانیارییە مەزەندەکراوەکان لە خەرجییە گشتییەکاندا و دابەشکردنیان بەسەر چالاکیە جیاجیاکاندا.

هەروەها مەزەندەی دەسهات لەسەرچاوە جیاجیاکانیدا پێشکەش دەکرێت، سەرەرای مەزندەکردنی توانای باجەکان و، لەکۆتاییدا زانستی ئامار زانیاری گرنگ و پێویست دەداتە بریار بەدەستانی رامیاری دارایی کە پەیوەستە بە داهاتی نەتەوەیی خەملێندرلو و چۆنیەتی دابەشکردنی و قووچەکی دانیشتوانی بابەتی تر، بەمجۆرە پەیوەندی نێوان ئەم دوو زانستە پتەو دەبێت .

لەمانەی سەرەوەدا بۆمان روون دەبێتەوە کەوا پەیوەندیەکی پتەو هەیە لە نێوان زانستی دارایی گشتی و زانستەکانی ئاماژە پێکراوە، هەروەها زانستەکانی دیکەی وەك ژمێریاری و ماتماتیك و کۆمەڵناسی و .....تر . بابەتی ئەم زانستانە هەموویان لە خزمەتی مرۆڤدان و بەشێوەیەکی بەهێز لە رەفتارو ئامانجدا بەیەکەوە گرێدرلون سەرەرای ئەوەش لەگەڵ پەرەسەندنی شێوەی ژیانی و رەفتاری مرۆڤ پەرەدەسێنی.

**جیاوازی دارایی گشتی و دارایی تایبەتی:**

**(پرۆژەی تایبەتەکان)** هەمیشە بۆ بەدەستهێنانی قازانج هەوڵدەدەن وتاکە پێوەر کە ئەم پرۆژانە لە دارشتنی پرۆگرامەکان و نەخشەدانانی پلانەکانیان پشتی پێ دەبەستن، بۆیە رێساکانی دارایی گشتی تەنها لەسەر بوارە گشتییەکان جێبەجێ دەکرێ ، ولتا لەسەر ئەم پرۆژانەی کە دەوڵەت سەرپەرشتی دەکات بۆ دابینکردنی پێداویستییە کۆمەڵەکییەکان.

**(پرۆژە گشتییەکان)** لەسەر بنەمای خزمەتگوزارییە گشتییەکان وبیرۆکەی دامەزراندنی ئابوورییەکی گەشەکردوو دامەزراوە لە بنەرەتدا ئەوپەری بەرژەوەندی گشتی بەدی بێنی، ئەم مەبەستانەی کەوا دەوڵەت ئامانجیەتی لەوانە رەخساندنی دەرفەتی کارکردنە بۆ تاکەکان کەوا ساڵ بەدوای ساڵ ژمارەیان زیاتر دەبێت وهەروەها لەوانەیە مەبەست سوود وەرگرتن بێت لە پەرەپێدانی پیشەسازی نوێ بۆ ئەوەی بگاتە کاروانی ولاتە پێشکەوتووەکان، بۆیە بیرۆکەی پرۆژە گشتیەکان لەسەر بنەمای بەدەستهێنانی قازانج بەماناتەسکەکەی ناگەیەنێ وەك لە پرۆژە تایبەتیەکاندا هەیە.

**لێرەدا چەند جیاوازیەك هەیە لە نێوان دارایی گشتی و دارایی تایبەتیدا گرنگترینیان ئەمانەن :**

١ - لەباری شێوازەوە:

سەرەتا دەوڵەت خەرجیەکان دەست نیشان دەکات دواتر بری ئەم دەسهاتە دیاری دەکات بۆ ئەوەی خەرجیەکانی پێ پر بکاتەوە وەپێویستە لەکاتی ئاساییدا دەسهاتەکان لە خەرجیەکان زیاتر نەبن بۆ ئەوەی تاکەکان بێبەش نەبن لەم سامان و داراییەی کەوا دەوڵەت پێویستی پێ نییە، ئەوەش

بە برینی باجەکان کەوا خەرجیان نەکردووە، بەلام تاك سەرەتا دەسهاتەکەی مەزەندە دەکات ئینجا لە سنووری ئەم دەسهاتەوە خەرجیەکانی دەکات، ئەم جیاوازییە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەوا توانای دەولەت لە قەرزکردن

فرەوانترە لە چاو توانای تاکدا ومتمانەی قەرزدەران بە دەولەت گەورەترە لە متمانەیان بۆ تاکەکان .

٢ - لەبارەی ئامانجەوە:

ئامانجی دەولەت لەپێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان زۆربەی جار قازانج نییە، بەلکو ڕەچاوکردنی هەندێ شتی ترە وەك رەخساندنی دەرفەتی کەلك وەرگرتن لە خزمەتگوزارییەکان بەبێ جیاوازی ، ئەمە ئەوە ناگەینێ کەوا دەولەت دەرامەتی دەست نەکەوێ بۆ بوودجە لە ئەنجامی سەرپەرشتی کردن و بەرێوەبردنی هەندێك لە پرۆژەکان.

٣- لە بارەی رێکخستنەوە:

شێوازەکانی ژمێریاری دەولەت لەگەلێ ئەو شێوازانەی کە تاك پەیڕەوی دەکات جیاوازە، چونکە دەولەت لەسەری پێویستە هەموو پابەندییەك لە تۆمارە حکومییەکان بکات و ئەو دەسهاتەش کەلەماوەی سالی داراییدا دەستی دەکەوێ دیاری بکات. بەلام پرۆژە تایبەتییەکان لەسەر بنەمای بەدەستهێنانی خەرجی یاخود دەسهات بەرێوە دەچێت بۆ ئەوەی هەر ماوەیەکی ژمێریاری تەنها بە خەرجی و دەسهاتەوە دیاری بکات تاکو باری دارایی پرۆژە بزاندرێت لە ماوەی سالێکی داراییدا .

٤- لەبارەی خاوەنداریەتی:

هەروەها دارایی گشتی لەگەڵ دارایی تایبەتدا لە شێوەی خاوەنداری جیاوازیان هەیە. چونکە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لە پرۆژە گشتییەکان مولکی تاکە کەسێك یان کۆمەڵێك نییە، بەڵکو مولکی هەموو کۆمەڵگەیە، بەڵام پرۆژە تایبەتییەکان مولکی تاکە کەسێك ویان کۆمەڵێك کەسە ، بۆیە مەبەستی چالاکیەکانیان لەهەر یەکێکیان جیاوازە .

## بابەتەکانی دارایی گشتی:

بەر لەوەی لە بابەتەکانی دارایی گشتی بکۆڵینەوە، پێویستە ئەرکەکانی دارایی گشتی روون بکەینەوە، چونکە گرنگی خۆی هەیە، سەرنەکەوتنی بازاڕ لە دابینکردنی هەندێك شمەکدا بەرفراوانبوونی رۆڵی دەوڵەتی هاوچەرخ وسەرهەڵدانی هەندی پێداویستی کە پێویستە دەوڵەت دابینی بکات ئەمەش دەبێتە هۆی فرلوان بوونی خەرجیەکانی حکومەت و فراوان بوونی دەسهاتە گشتییەکان، ئەمەش وادەکات رۆڵ وکارو ئەرکەکان کە دارایی گشتی پێی هەڵدەستێت رۆشنایان بخرێتەسەر بۆ ئەوەی کاریکەنە سەر ئابووری و ئاستی خۆش گوزەرانی کۆمەڵگە .

ئەرکەکانی دارایی گشتیش ئەمانەن :

یەکەم – ئەرکی تەرخانکردن: Allocation Function

کاتێك سیستەمی بازاڕ ناتوانێت هەندێك لە شمەکەکان دابین بکات ئەوا دەوڵەت هەڵدەستێ بەدابینکردنی ئەم شمەکانە کە پێیان دەوترێت شمەکە گشتییەکان ودابینکردنی ئەم شمەکانە پێویستی بە تەرخانکردنی دەرامەتە

ئابوورییەکان هەیە لە نێوان شمەکە تایبەتییەکان و شمەکە گشتییەکاندا، و دواتر دابەشکردنی ئەو دەرامەتە دیاریکراوانە بۆ بەرهەمهێنانی شمەکە گشتییەکان کە ئارەزووی لەسەرە وە تەرخانکردنی دەرامەتەکان پێویستە تەرخانکردنێکی لەباربێ بۆ بەدیهێنانی بەرزترین پلەی خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵگە، واتە تەرخانکردنێکی نموونەیی بێت.

دووەم – ئەرکی دابەشکردن: Distribution Function

دابەشکردنی داهات وسامان لە هەر کۆمەڵگەیەکدا پشت بە دابەشکردنی خاوەندارێتی دەرامەتە ئابوورییەکان ( زەوی ، سەرمایە ، کار و ڕێکخستن) دەبەستێت. دابەشکردنی داهات و سامان لەوانەیە بگونجێت یان نەگونجێت لەگەڵ بنەماکانی دادپەروەری لە کۆمەڵگەدا. زۆریەی نووسەران لەسەر ئەوە کۆکن کە پێویستە هەموار (تعديل) هەبێت کە وەك دووبارە دابەشکردنێکە Redistribution بە مەبەستی دابینکردنی گونجاوترین ئاستی خۆشگوزەرانی بۆ خاوەن داهاتە نزمەکان. بەم شێوەیە گرنگیدان چارەسەرکردنی باری گشتی دادپەروەریی وداهات لەبەرزترین پایەی دابەشکردن (خاوەن داهاتە زۆرەکان) گوازراوتەوەوە بۆ چارەسەرکردنی شێوەی داهات لە نزمترین پایە ( خاوەن داهاتە کەمەکان).

سێیەم – ئەرکی سەقامگیرکردن: Stabilization Functio

دارایی گشتی هەڵدەستێ بەهێنانەدی ئەم ئەرکە ئەویش لە ڕێگای بەهێنانەدی خستنەگەڕی تەواو (التشغيل الكامل) و لەگەڵ پلەیەکی گونجاو لە سەقامگیری لە بەرهەمهێنان و ئاستی گشتی نرخەکان. واتا ڕۆڵەکەی وەك رامیارییەك لە چارەسەرکردنی کێشەکانی بێکاری و هەڵاوسان بەدیار

دەکەوێت، بەڵام ئابووری ئازاد (ئابووری بازاڕ) دەتوانێ نەخستنەگەڕی تەواو بهێنێتەدی ونە ئاستی گشتی نرخەکان سەقامگیر دەکات بە شێوەیەکی خۆیەکی. هەربۆیە ئابووری ئازاد دووچاری بارگۆڕان لە بەرهەمهێنان و نرخدا دەبێتەوە وتووشی بێکاری و هەڵاوسان دەبێت بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، یان پێکەوە تووشی بێکاری و هەڵاوسان دەبێت (هەڵاوسانی داکشاو) لەبەر شکست هێنانی سیستەمی بازاڕ.

چوارەم – ئەرکی گەشەپێدان Growth Function

ئەرکی دارایی گشتی تەنها بە گەیاندنی بەرهەمی نەتەوەیی بۆ ئاستی خستنەگەڕی تەواو و کەمکردنەوەی بێکاری و هەڵاوسان تەواو نابێت، بەڵکو هەوڵدەدات بۆ بەدەستهێنانی پەرەسەندنی ئابووری Economic Growth دوو سەرچاوەش هەیە بۆ گەشەکردن ئابووری، کە ئەمانەن:

– گەشەپێدانی دەرامەتە ئابوورییەکان Growth of Economic Resources

– گۆڕانی(پێشکەوتنی) تەکنەلۆژی Technical Change (Progress)

بۆنموونە: رامیاری دارایی دەتوانێت کار بکاتە سەر تێکڕای پاشەکەوتکردن لە رێگای:

١. گۆڕینی تێکڕای باج.

٢. ئارەزووبوون لە وەبەرهێنان لە رێگای لێخۆشبوون لەباج و ئەو بەخشین و کۆمەکانەی پێشکەش بە وەبەرهێنەکان دەکرێن لە هەندێك بواری چالاکی ئابووریدا بە ئامانجی هاندانی وەبەرهێنان.

## بابەتەكانی دارایی گشتی:

**یەكەم: پێداویستییە گشتییەكان: Public Wants (Goods)**

بۆ جیاكردنەوەی پێداویستی گشتی و پێدلویستی تایبەتی نووسەرانی دارایی گشتی خەڵكیان بۆ دوو جۆر دابەش كردووە:

**١- پێداویستییە تایبەتییەكان: Private Wants**

ئامانجی تاكەكەسی لە چالاكییە ئابوورییەكان بەدەستهێنانی شمەك و خزمەتگوزارییە بە مەبەستی پڕكردنەوەی پێداویستییەكانی. لەوانەیە ئەم پێویستییە تاكە كەسێك بەتەنیا هەستی بكات، ئەم هەستەش لەكەسێكەوە بۆ كەسێكی دیكە جیاوازی هەیە، هەروەها لەهەمانكاتدا پێداویستی بۆ شمەك و خزمەتگوزارییەك لە كاتێكەوە بۆ كاتێكی تر جیاوازە، ئەم جۆرە شمەك و خزمەتگوزاریانەش پێیان دەگوترێت (شمەكی تایبەت) كە بە دەستهێنانیان لەوانەیە تایبەت بن بەكەسێكەوە، ئەو كەسە بەرپرسیارە لەدابینكردنی ئەوكەلوپەلە لە بازاڕ بەرامبەر ئەو پارەی دەیداتە فرۆشیارەكە.

میكانیزمی بازاڕ زۆر چالاكانە كار دەكات بۆ دابینكردنی ئەم شمەك و خزمەت گوزارییانە وكەرتی تایبەت خۆی تەرخان دەكات، هەروەها شان بەشانی كەرتی تایبەت دەوڵەتیش لە رێگای دەزگاكانییەوە هەڵدەستێ بە دابینكردنیان وەك شمەكی تایبەت دەفرۆشرێنە كڕیاران، نموونە لەسەر ئەم شمەكە تایبەتیانە (ئینجا لە لایەن كەرتی تایبەتەوە كرابن یان لەلایەن كەرتی گشتییەوە) وەك خۆراك ، خانوو ، خزمەتگوزارییەكانی گەیاندن و تەندروستی و پزیشكی ...هتد .

## ٢- پێداویستییە گشتییەکان (کۆمەڵایەتییەکان) Wants Social

لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەت پێداویستی بۆ بەدەستهێنانی شمەك و خزمەتگوزارییەکانی تر سەریان هەڵدا، ئەمەش بەم پێیەی کەوا تاك لە کۆمەڵێکی مرۆیی رێکخراودا دەژێت پێی دەگوترێت (پێداویستییە گشتییەکان) کە (بریتییە لەو پێداویستیانەی جۆرە سروشتێکی کۆمەڵایەتیان هەیە، چونکە هەر لەو کۆمەڵگەیەدا هەڵدەقولێت ئەم شمەك و خزمەتگوزارییانە تاکەکان هەستی پێدەکەن ئەوا پێداویستی کۆمەڵەکین، کەواتا ئەم جۆرەپێویستیانە بوونیان نییە گەر تاکەکان لە کۆمەڵگەکاندا نەبن ئەم شمەك و خزمەتگوزاریانە پێشکەش بە هەموو تاکەکان دەکرێت نەوەك تەنها تاکە کەسێك بەم پێیە پێیان دەگوترێت (شمەکە کۆمەڵایەتییەکان) یان شمەکە گشتییەکان، ئەم شمەك و خزمەتگوزارییانە لەوانەیە تاکە کەسێك نەتوانێ بە تەنها بەدەستی بهێنێ، هەتا ئەگەر بە دەستیشی بهێنێت ئەوا ناتوانێ بە تەواوی پێداویستییەکانی پڕبکاتەوە و دواتر ناتوانێت تێچووەکەی لەئەستۆ بگرێت لێرەدا بازاڕ بە چالاکی کارناکات بۆ دابینکردنی ئەم جۆرە شمەك وخزمەتگوزارییانە، واتە بازاڕ شکستی هێناوە. بۆیە لەسەر دەوڵەت پێویستە دەستەبەری ئەم شمەك وخزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییانە بکات،یان کەرتی گشتی بە ناچاری بەرهەمیان دێنێت ، بۆ نموونە تەنها دەزگاکانی کەرتی گشتی هەڵدەستێ بەدابینکردنی خزمەتگوزاری ئاسایش و بەرگری و دادپەروەری، هەروەها کەرتی گشتی و تایبەتی پێکەوە پێشکەشی دەکەن، بەڵام دەوڵەت نرخەکەی دەدات، بۆ نموونە پوختەکردنی هەوای پیس کەوا هەوای پوختەکراو بۆ گشت تاکەکان دابین دەکرێت بەبێ ئەوەی هیچ پارەیەك بدەن یان رووناك کردنەوەی شەقامەکان یاخود پاککردنەوەیان لە بەفر و یان راماڵینی تۆز وخۆڵ.

## پێوەرەکانی دارایی گشتی بۆ دیارکردنی سروشتی پێداویستییە گشتییەکان:

١ - سروشتی پێوەری سروشتی ئەو لایەنەی هەڵدەستێ بە پڕکردنەوەکە:

پشت بەو دەستە دەبەستێ کە بە پڕکردنەوەی پێداویستییە گشتیەکە هەڵدەستن نەوەك بە خودی پێداویستیەکە، ئەگەر دەولەت یان دەسەلأت یان یەکێك لە دەزگاکانی هەڵسان بەپڕکردنەوە لە ڕێگای خەرجیە گشتیەکانەوە ئەوا بەپێداویستیەکی گشتی دادەنرێ وپێچەوانەش راستە.

٢- پێوەری سەرچاوەی هەستکردن بە پێداویستییەکان:

ئەگەر سەرچاوەی هەست پێکردنەکە تاکە کەس بوو ئەوا پێداویستیەکە تایبەتییە، بەپێچەوانەوە دەبێتە پێداویستی گشتی ئەگەر سەرچاوەی هەستپێکردنەکە بە کۆمەڵ بێت.

٣- پێوەری گەورەترین کەڵك بەکەمترین تێچوون:

تاکەکەس هەوڵدەدات پێداویستیەکانی بەکەمترین تێچوون پڕبکاتەوە یاخود زۆرترین رادەی پڕکردنەوە بە کەمترین خەرجی بەدی بێنێ، بەلأم پێداویستی گشتی ئەم یاسایە نایگرێتەوە.

٤- پێوەری ڕۆڵی کۆنی دەولەت:

ئەم پێوەرە دەگەرێتەوە بۆ ئەرکی دەولەت، بۆیە پێداویستییەکان دەبنە گشتی لە چوار چێوەی دەوڵەتی پاسەوان کە ئەرکی بەرگری و ئاسایش و دادپەروەری لە ئەستۆ بوو، کە ئەمەش بۆ دەوڵەتی پلاندانەر زیاترە، کە بە بەرپرسیاریەتی لە هاوسەنگی ئابووری کۆمەلأیەتیدا لە کۆمەڵگە هەڵدەستێ.

٥- پێوەری سروشتی پێداویستیەکە و سروشتی ئەو لایەنەی کە هەڵدەستێ بەپڕکردنەوەی:

دیاری کردنی پێدلویستییە گشتییەکان پشت بە دوو بنەما دەبەستێت کە پێویستە پێکەوە گرێدرابن بۆ ئەوەی سیفەتی گشتگیری پێ بدرێ، کە ئەم دوو بنەمایەن:

١. دابینکردنی پێداویستی کەڵکی کۆمەڵیان هەبێ.
٢. دابینکردنی پێداویستییەکان بخرێتە سروشتی رۆڵی دەوڵەت.

**دووەم - خەرجیە گشتیەکان:** Public Expenditure

**١- چەمکی خەرجیە گشتییەکان:**

دەتوانرێ بەم شێوەیە خەرجیە گشتییەکان پێناسە دەکرێت:

**(بڕە پارەیەکی نەختیینەیە لە لایەن کەسێکی گشتییەوە خەرج دەکرێت بە مەبەستی بەدیهێنانی کەڵکێکی گشتی).**

لەم پێناسای سەرەوە ئەوە دیار دەکەوێت کە خەرجی گشتی خۆی لەم سێ پێکهاتەی (رەگەز) خوارەوە دەنوێنێت:

**١-خەرجی گشتی بڕە پارەیەکی نەختینەییە.**
**٢-خەرجی گشتی کەسێکی گشتی ئەنجامی دەدات.**
**٣-مەبەست لە خەرجییە گشتییەکان بە دیهێنانی کەڵکێکی گشتییە.**

أ- خەرجی گشتی بڕە پارەیەکی نەختینەییە:

پەرەسەندنی چالاکییە ئابوورییەکان وایکرد لە سیستەمی(شت بەشت گۆڕینەوە) بگۆڕێت بۆ سیستەمی ئابووری، لێرەدا بەکارهێنانی پارە بووە هۆکارێك بۆ ئاڵوگۆڕکردن. دەوڵەت پارە بۆ بەدەستهێنانی شمەك و خزمەتگوزاری گشتی و پێشکەشکردنی باریۆ وکۆمەك ودانەوەی سوو وقەرزەکە بە کاردەهێنێت . بۆ نموونە : دەوڵەت پارەی نەختینە بە کاردێنێ بۆ پێدانی مووچە و کرێ و کڕینی شمەك و پێدانی یارمەتییەکان و سووی قەرز و ئامێر و باڵەخانە و... هتد. ولتە خەرجییە گشتییەکانیش دەبێ بە پێی یاسا بکرێن.

ب - خەرجی گشتی کەسێکی گشتی ئەنجامی دەدات:

پێویستە ئەو بڕە پارەیەی کە بەکار دەهێنرێت بۆ مەبەستی بە دەستهێنانی شمەك و خزمەتگوزارییە گشتییەکان ئەو خەرجیانە لە ئەستۆی دەوڵەت دەربچن بە پێی فەرمانی کەسێکی یاسایی گشتی، ئەو کەسانەش بریتین لە دەزگاکانی حکومەتی ناوەندی یان حکومەتی ناوخۆیی، بەڵام بۆ نموونە ئەگەر کەسێك قوتابخانەیەك یان نەخۆشخانەیەك دروست بکات وپێشکەشی دەوڵەتی بکات، ئەوا ئەو خەرجکردنە نابێتە خەرجییەکی گشتی، لە بەر ئەوەی لە لایەن کەسێکی یاسایی گشتی یەوە دەرنەچووە .

ج - مەبەستی خەرجییە گشتییەکان بە دیهێنانی کەڵکی گشتییە:

ئەو دوو مەرجەی پێشەوە پێویستن بە دیارکردنی خەرجییە گشتیەکان، بەڵام هێشتا مەرجەکانی خەرجی گشتی ناهێنێتە دی، بۆیە

پێویستمان بە مەرجی سێیەم هەیە بۆ بڕیاردان لە سەر خەرجیەکان بۆ ئەوەی ببێتە خەرجی گشتی، ئەویش بریتییە لە ئامانجی بەرژەوەندی گشتی.

ئەگەر کەسێك پارە خەرج بکات بە مەبەستی کڕینی شمەکێك یان خزمەتگوزاریەك بە مەبەستی تێرکردنی پێداویستیەکانی خۆی ، هەر وەها گەر بەرهەمهێنێك پارە خەرج بکات بۆ بەرهەمهێنانی شمەکێك یان خزمەتگوزارییەك بە مەبەستی بەدەستهێنانی بەرزترین رادەی قازانج ، ئەمە بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسێکە نەك بەرژەوەندی گشتی، بەڵام ئەگەر دەوڵەت پارە بۆ دابینکردنی شمەك و خزمەتگوزاری گشتی یان بۆ کۆمەك و یارمەتییەکان خەرج بکات، ئەوا بە مەبەستی بە دیهێنانی کەڵکی گشتییە و بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزارانییە لە کۆمەڵگەدا.

٢-ڕێسای خەرجییە گشتییەکان:

پێویستە خەرجیەکانی حکومەت لە بوارە جیاجیاکاندا بەپێی ڕێسا یان بنەماکان رەچاو بکات بۆ ئەوەی خەرجییەکان ببنە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی.

چەند ڕێسایەك هەیە لەوانە:

یەکەم – ڕێسای کەڵکی تێچوون:

بەپێی ئەم ڕێسایە پێویستە:

أ- کۆمەڵگە زۆرترین پوختەی کەڵك یان دەسکەوتی لە خەرجیە گشتییەکانی دەوڵەتی بەرکەوێ، ئەمەش ئەو ئاستەیە کە خەرجیەکانی حکومەت تیایدا

ڕادەی کـەڵکی سـنوورەکی کۆمەڵایـەتی لەگـەڵ ئاسـتی خـۆش گـوزەرانی کۆمەڵگە یەکسان دەبێت .

ب- پێویستە پلاندانەر ئـەو ڕێسـایە لـە بـەر چاو بگرێت جا چ بـۆ خـەرجی شمەك و کارگوزاری گشتی یان بـۆ یارمەتیـدان یـان بـۆ وەبـەرهێنانی گشـتی بێت. بەولتایەکی تر پێویستە ڕادەی کەڵکی سنوورەکی کۆمەڵایەتی بـۆ هـەر دینارێکی خەرجکراو لە هەر بوارێك لە بوارەکانی خەرجییە گشتییەکان دەبێ یەکسان بێت.

ج- لە خەرجییە گشتییەکان ڕەچاوی دابەشکردنی جوگرافی بکرێت بەسەر ناوچە و هەرێمەکان.

د-نابـێ بەدەسـتهێنانی بـەرزترین پوختـەی کـەڵك لەگـەڵ بـەدیهێنانی ئامانجـەکانی تـەرخانکردن و دابەشـکردن و سـەقامگیری و پەرەسـەندن دژ بەیەکبن.

دووەم - ڕێسای ئابووریانە لە خەرجکردندا:

ئەمەش ڕێسایەکی کلاسیکییە(کۆنە) کە دەڵێت بـە شـێوەیەکی ئابووریانـە خەرجییـە گشـتییەکان بـەکاربێت و بـەفیڕۆ نـەدرێت، کـە دەوترێـت بـە شێوەیەکی ئابووریانە ئەمە مانای ئەوە نادات کە ڕادەیـەك بـۆ خەرجییـەکان دابنرێت یان کەم بکرێتـەوە گـەر هۆکـاری پێویسـت هـەبوو بـۆ خـەرجکردن. بەڵکو مەبەست ئەوەیە خەرجیەکان بە شێوەیەکی دروست ئاراسـتە بکـرێن و دژایەتی زێدە خەرجکردن و بەفیڕۆدان بکرێ، هەوڵبـدرێ زۆرتـرین داهـات بـە کەمترین تێچوون بەدەست بێت.

زێده خەرجكردن دوو ئەنجامی لێ دەكەوێتەوە، لە لایەكەوە بە فیڕۆدانی بڕێكی زۆر لە پارە بە كاری ناپێویست، لە لایەكی دیكەوە دەبێتە هۆی بێهێزبوونی متمانەی خەڵك بەدارایی گشتی دەوڵەت و خۆشاردنەوەیان لە باجدان.

**دیاردەی زێدە خەرجكردنی حكومەت جۆراوجۆرن كە لەوانەیە لەگشت بوارەكانی خەرجی گشتی رووبدات، بەتایبەتی لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، لەوانەش:**

١- دامەزراندنی ژمارەیەكی زۆری فەرمانبەر وكرێكار لە دام ودەزگا حكومییەكان كە زۆر زیاترە لە پێویستی ئەم دەزگایانە.

٢- گرنگیدان بە بنیادنانی باڵەخانەی مەزن و داپۆشینی دەزگا و فەرمانگە حكومییەكان بەشتی گرانبەها و بەكرێگرتنی باڵەخانەو ئۆتۆمبێل بە پارەیەكی زۆر لە جیاتی كڕینیان.

٣- زێدەڕۆییكردن لە بەكاربردنی گشتی وەك: خەرجی رووناكی و ئاو و تەلەفۆنات، كە دەوڵەت پارەكەی دەدات بەبێ بەكارهێنانیان بۆ جێبەجێكردنی چالاكی گشتی وبەدیهێنانی سوودی گشتی.

٤- بەكارهێنانی كاری گشتی لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتدا كە مافی كۆمەڵە نەك تاكەكەس، وەك بەكارهێنانی ئۆتۆمبێلی فەرمانگە بۆ كاری ماڵەوە.

**سێیەم - رێسای تەرخانكردن:**

دەسەڵات ئەو رێگەیەی كە پەیوەندی بە خەرجییەكان و روونكردنەوەی هەنگاوەكانی پێدان و رێوشوێنە پێویستەكانی هەریەكە لەوانە هەیە دیاری دەكات، بۆ ئەوەی خەرجیە گشتییەكان بە شێوەیەكی دروست ئاراستە

بکرێن و سوودی گشتی بدات بەدەستەوە کە ئامانجی کۆتایی خەرجی گشتییەکانە.

بۆیە دەستگرتن بە چالاکییە دارایی و خەرجییەکانی حکومەت دەبێ بەپێی ئەو ڕێووشوێنانە بێت کە دەیەوێت بهێنێتەدی و دایبڕێژێت و جێبەجێ بکات لە بودجە و یاسا و بڕیارە داراییەکانی ترەوە.

٣-جۆرەکانی خەرجییە گشتییەکان:

خەرجییە گشتییەکان شێوەی جۆراوجۆری هەیە، زیادبوونی جۆرەکانی بە زیادبوونی ئەرکەکانی دەوڵەت بەسترلوەتەوە و بەزیادبوونی دیاردەی دەستخستنی لە ژیانی گشتی کۆمەڵگەدا، خەرجییە گشتییەکان جۆرلوجۆرن بۆیە جیاوازیشیان لە نێوانیاندا هەیە چ لەڕووی پێکهاتە یان لە بواری ئاسەوارە ئابووری و دەرئەنجامە داراییەکانەوە. هەر بۆیە زانایانی بواری دارایی گشتی دابەشکردنی جۆرا و جۆریان بۆ خەرجییە گشتییەکان داناوە.

دەتوانین خەرجیە گشتیەکان بە پێی سروشتە ئابوورییەکەی دابەش بکەین، کە ئەمەش بە دابەشکردنی ئابوورییەکان یان دابەشکردنی زانستی ناسراوە. بە شێوەیەکی گشتی خەرجیە گشتییەکان دابەش دەبێت بۆ ئەم جۆرانەی خوارەوە:

١- خەرجییە کارگێڕییەکان: بریتییە لەو خەرجییانەی کە پەیوەستە بە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی کاری دەزگا خزمەتگوزارییە گشتییەکان بۆ دەوڵەت پێویست و گرنگن وکە ئەوانیش بەڕێوەبردنی گشتی وبەرگریکردن و ئاسایش ودادپەروەری ونوێنەرایەتی رامیاری دەگرێتەوەو گرنگترین بنەماکانی ئەم جۆرە خەرجییە خەرجی بەرگری نیشتمانییە.

٢- خەرجییە کۆمەڵایەتییەکان: ئەم جۆرە خەرجییە لەم بوارانەدا خەرج دەکرێ کە دەیەوێ کاریگەرییەکی کۆمەڵایەتی دیاریکرلو لەنێوان تاکەکان بەدی بێنی لەرێگەی بەدەستهێنانی رۆشنبیریی و فێرکردن و چاودێریکردنی تەندروستی تاکەکان، سەرباری ئەوەش بەدەستهێنانی هاوکاری کۆمەڵایەتی لەرێگەی یارمەتیدانی هەندی چین کە پێویستییان بە یارمەتی هەیە وەك(داهات کەمەکان و بێکارەکان...تد) گرنگترین کۆمەك بۆ ئەم توێژانە ئەوانەی کە پەیوەندی بە دامو دەزگا تەندروستییەکان و رۆشنبیری و گشتی نیشتەجێ بوونەوە هەیە.

٣- خەرجییە ئابوورییەکان: بریتییە لەو خەرجییانەی کە دەوڵەت هەڵدەستێ بە خەرجکردنی لەبوارەکانی خزمەتگوزارییە گشتییەکان بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکان وەکو وەبەرهێنانی گونجاو بۆ ئەوەی کەڵك بە ئابووری نەتەوەیی بگەیەنێ لەبواری خزمەتگوزارییە سەرەکییەکانی وەکو گواستنەوەو گەیاندن و وێستگەکانی بەرهەمهێنانی کارەباو ئاو و ئاودێری وجگە لە کۆمەککردنی ئابووری بە پرۆژە گشتی و تایبەتییەکان.

٤- خەرجییە داراییەکان: قیستەکانی بەکاربردنی قەرزی گشتی و سووی ساڵانە دەگرێتەوە.

٥- خەرجییە سەربازییەکان: هەموو خەرجییەکانی پڕ چەککردن و هێزە چەکدارەکان دەگرێتەوە.

دیاردەی زیادبوونی خەرجی گشتی:

ئەم دیاردەیە بە یەکێك لە خەسڵەتەکانی دارایی گشتی لەسەردەمی نوێ دادەنرێ لە پێناو دابینکردنی خزمەتگوزاری بۆ کۆمەڵگەو دانانی سنوورێك بۆ قۆرخکاری و سەقامگیری ئابووریدا، لە کاتێکدا قەبارەی خەرجی گشتی لە زۆربەی وڵاتانی جیهان بەشێوەیەکی بەردەوام لە زیادبوون دایە، مێژووی

دارایی لە زۆربەی وڵاتەکانی جیهانی بە جیاوازی سیستەمی سیاسی و سروشتی پێکهاتەکەی وبارودۆخی ئابوورییەوە ئاماژە بەبوونی دیاردەی زیادبوونی خەرجی گشتی دەدەن .

## هۆکارە ڕاستەقینەکانی زیادبوونی خەرجی گشتی:

گەشەی راستەقینە لە خەرجییە گشتییەکان ئاماژە بە زیادبوونی بەشی تاکەکان دەدەن لە خزمەتگوزاری و شمەکە گشتییەکاندا کە حکومەت دابینیان دەکات بۆ کۆمەڵگە، یان زیادبوونی خەرجییەکان بۆ چاکردنی ئاستی خزمەتگوزارییەکان کە پێشکەشی دەکەن یان زیاتربوونی یاخود باشتربوونی شێوازەکانی بەرهەمهێنە گشتییەکان کە بە شێوەی نەختینەیی گوزارشتی لێ دەکرێ وەکو زیادبوونی خەرجییە گشتییەکان.

هۆکارە ڕاستەقینەکانی زیادبوونی خەرجی گشتی بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە:

١. هۆکارە ئابوورییەکان:

زیادبوونی سەرجەم خەرجییە گشتییەکان لە ئەنجامی هۆکارە ئابوورییەکان دەگەڕێتەوە بۆ:

أ- گەشەپێدانی ئابووری و زیادبوونی داهاتی نەتەوەیی:

بەرزبوونەوەی تێکڕای داهاتی راستەقینەی تاك وەك بارۆدۆخێکی سروشتی هاوکاتە لەگەڵ گەشەکردن ئابووری لە کۆمەڵگەیەکدا ولە ئەنجامی ئەمەشدا خواست لەسەر شمەك و خزمەتگوزاریەکانی بەکاربردن زیاد دەبێت. وهەروەها شمەك وخزمەتگوزاری گشتی دووبارە خواستیان لەسەر زیاد دەبێت وەکو بەشێك لە خواستی کۆمەڵگە کاتێ ئاستی داهاتیان بەرز دەبێتەوە.

ب- پێشکەوتنی ڕۆڵی دەوڵەت:

دەوڵەت لە رابردوودا رۆڵی بێ لایەنی هەبوو، دەوڵەت رۆڵێکی گەورەی نەبوو لە پرکردنەوەیی هەموو پێدلویستییە گشتییەکان جگە لە تەندروستی و فێرکردن و بەرگری نەبێت ... وئەمەش دەرئەنجامی هەرەسهێنانی بازاڕ، و سەقامگیرنەبوونی سیستەمەکانی سەرمایەداریدا لێ کەوتۆتەوە، بۆیە رۆڵی دەوڵەت گۆڕانی بەسەردا هات و دەستی خستە نێو چالاکی ئابووری بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەی سەرەوە، ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی خەرجی گشتییەکانی دەوڵەت.

**٢. هۆکارە رامیارییەکان (سیاسییەکان):**

**هۆکارە رامیارییەکانی زیادبوونی خەرجی گشتی دەکرێنە دووبەش:**

أ - هۆکارە رامیارییە ناوخۆییەکان:

**ئەم هۆکارانەش ئەمانە دەگرێتەوە:**

**أ- بڵاوبوونەوەی بنەماو سیستەمەکانی دیموکراسیەت.**

ب- زیاد بوونی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی حکومەت لە بەرامبەر کۆمەڵگەدا لە دابینکردنی ئەوپەڕی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی خەرجی گشتی لە بەرژەوەندی تاکەکانی کۆمەڵگەدا بەتایبەتی چینی هەژار لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی داهات و کەمکردنەوەیی جیاوازی داهاتەکانیان و قەرەبووکردنەوەی ئەو تاکانەی کە لەئەنجامی بڕیارێکی دادوەریی بەر تاك یاخود کۆمەڵێ کەس دەکەوێت.

ج- زۆربوونی پارتە سیاسییەکان و بڵاوبوونەوەیان بۆتە هۆی ئەوەی دەوڵەت پەنا بۆ زیاترکردنی پرۆژەکان ببات بۆ وەرگرتنی رەزامەندی

دەنگدەران و زیاترکردنی دامەزراندنی لایەنگرانی پارتەکەو زیادبوونی خەرجییەکان.

د- بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لەناو دامودەزگاکانی دەوڵەت بەهۆی هەڵسوکەوتی هەندێ لێپرسراوان و زیاد بوونی کاری بەرتیل وەرگرتن و خراپ بەکارهێنانی دارایی گشتی لەلایەن فەرمانبەرانی پایەبەرز و زیادبوونی تێچوونی خزمەتگوزارییە گشتییەکان، کە دەبێتە هۆی زیادبوونی خەرجی گشتی.

ب- هۆکارە رامیارییە دەرەکییەکان:

أ- لەم چەند ساڵەی دواییدا بایەخی زیاتر بە نوێنەری دیبلۆماسی دراوە، ئەویش لەئەنجامی سەربەخۆبوونی وڵاتان و پێدلویستی زۆربوونی نێردە دیبلۆماسیەکان وقەبارەو شێوەکەی وبەشداریکردن لە کۆنگرەو کۆڕە نێودەوڵەتییەکان کە لەبارەی مەسەلە گرنگەکانی جیهان دەبەسترێ.

ب- دەوڵەت یارمەتی و کۆمەك پێشکەش بە وڵاتانی تر دەکات بەتایبەتی لەکاتی روودانی گێروگرفت و کارەساتە سروشتییەکانی وەك رووداوی لافاو و بوومەلەرزەو جگە لەو قەرزو کۆمەك و یارمەتیانە بە ئامرازێکی رامیاری دەرەوە دادەنرێ.

٣. هۆکارە داراییەکان:

دەتوانین بەم شێوەیە شی بکەینەوە :

أ- بوونی زیادە لە دەسهاتە گشتییەکان، یان بوونی یەدەگی پارە تەرخان نەکراو بۆ هیچ بوارێك.

ب- ئەم زیادەیە وا لە دەوڵەت دەکات پارەکە لە شتە ناپێویستەکان خەرج بکات. بیرمەندە داراییەکان وا دادەنێن کە دەوڵەت کاتێ دەسهاتی زۆری

دەست دەكەوێ ئەوا پابەند نابێت بە ڕێساكانی خەرجی گشتی بەشێوەیەكی ڕاست و دروست، بەڵكو زیاد لەپێویست خەرج دەكات و بەفیڕۆی دەدات.

بەشێوەیەكی گشتی دەوڵەتی پێشكەوتوو توانای جۆرلو جۆركردنی سەرچاوەكانی دەسهاتی هەیە لەبەر ئەوە قەبارەی خەرجییە گشتییەكانی گەورەتر دەبێت.

ج- دەوڵەت قەرزی ناوخۆیی و دەرەكی دەكات، سەدەی نوێ بە قەرزكردنی ئاسان ناسرلوە، لەبەر ئەوەی قەرزی گشتی واتای پێشتری نەماوە كە بەسەرچاوەیەكی نائاسایی دەسهاتە گشتییەكان دابنرێ و دەوڵەت بەكاری نەهێنێ تەنها لە بارۆدۆخی نائاسایی نەبێت، دەوڵەت لە پێناوی قەرز وەرگرتن ڕووبەڕووی ئاستەنگی زۆر دەبۆوە، كاتێك كە لایەنە قەرز دەرەكان مەرجی زۆر گرانیان دادەنا كە دەوڵەت دەبێت قورسایەكی زۆر لە ئەستۆ بگرێ.

ئەم ئاستەنگانە ئێستا كەم بۆتەوە لە ئەنجامی ئەوەی دەوڵەت پەنا دەباتە بەر دەركردنی قەباڵەكان (سندات) لە پێكهاتە جیاوازەكان بۆ هاندانی تاكەكان و لابردنی سووی قەرزەكانی بەمەرجی گونجاو بە تایبەتی پەنا دەباتە بەر قەرزی بە زۆرەملێ ئەگەر قەرزی ئارەزومەندانە نەبوو بۆ پڕكردنەوەی پێداویستییەكانی دەوڵەت لە دەرامەتی پێویست و پەنابردن بەر قەرزی گشتی كە دەبێتە هۆی زیادبوونی قەرزەكانی خزمەتگوزاری و دواتر زیادبوونی خەرجی گشتی.

٤. هۆكاره كارگێڕییه‌كان:

پێشكه‌وتنی ڕۆڵی ده‌وڵه‌ت و زیادبوونی ده‌ستوه‌ردانی له‌ ژیانی ئابووری و كۆمه‌لایه‌تی وایكرد ژماره‌یه‌ك دامه‌زراو به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی هاوكاری گشتی دابمه‌زرێ، له‌ كۆتاییدا زیادبوونی ژماره‌یه‌ك فه‌رمانبه‌ر له‌ دامه‌زراوه‌كانی ده‌وڵه‌ت دابمه‌زرێن، بۆیه‌ خه‌رجی ئه‌و به‌ڕێوه‌به‌رایتیانه‌ و گرانی به‌ڕێوه‌بردنیان و به‌فیڕۆدانی ده‌رامه‌ت و زیاد به‌كارهێنان كه‌ ئه‌م به‌ڕێوه‌به‌رایتییانه‌ پێی هه‌ڵده‌ستن كه‌ ئه‌مه‌ش بۆ ده‌زگای چاودێری گرانه‌ سه‌رپه‌رشتی هه‌موو كاره‌كانی بكات، كه‌ ئه‌م زیادبوونه‌ له‌ خه‌رجی گشتی ده‌بێته‌ هۆی زیادبوونی بارگرانی (عبء) تێچووی گشتی. له‌وكاته‌ی زیادبوونی به‌رهه‌م زیاده‌یه‌كی راسته‌خۆیه‌.

٥. هۆكاره جه‌نگییه‌كان:

هۆكاره جه‌نگیه‌كان له‌م سه‌رده‌مه‌دا گرنگییه‌كی تایبه‌تیان پێده‌درێ به‌هۆی زۆربوونی جه‌نگه‌كان و ئاماده‌كاری بۆ كاره سه‌ربازییه‌كان ئه‌و ده‌ره‌نجامانه‌ش كه‌ لێی ده‌كه‌وێته‌وه‌، ئه‌مه‌ش خه‌رجیه‌كانی سه‌ربازی زیاد ده‌كات له‌ كاتی جه‌نگ و ئاشتیدا.

خه‌رجییه‌كانی به‌رگری نیشتمانی ده‌بێته‌ هۆی زیادبوونی خه‌رجیه‌ گشتییه‌كان به‌ ئاراسته‌ی زیادبوونی به‌رده‌وام ساڵ دوای ساڵ وئه‌مه‌ش به‌گرنترین به‌شه‌كانی خه‌رجی میری داده‌نرێ ، زۆربه‌ی ئابووریناسه‌كان بایه‌خیان به‌م بواره‌ نه‌دلوه‌و به‌ره‌گه‌زێكی (لایه‌نێكی) سه‌ربه‌خۆی داده‌نێن له‌ ده‌سه‌لاتی رامیاری به‌ له‌به‌ر چاوگرتنی رامیاری و ستراتیژی و ئابووری و كۆمه‌لایه‌تی .

وە هۆکارەکانی زیادبوونی خەرجی جەنگ لە وڵاتە دواکەوتووەکان بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە:

أ- دڵنانی هێزی پێویست بۆ بەرگریکردن لە دەوڵەت .

ب- پێشکەوتنی هونەری لە پێویستییە جەنگییەکان کە دەبێتە هۆی زیاد بوونی خەرجی تێچوونی ئامادەکاری سوپا بە ئامێرە پێشکەوتووەکان وە مەشق پێ کردنیان.

ج- زیادبوونی شەڵەژانی نێودەوڵەتی و ناکۆکییە هەرێمایەتییەکان و جەنگەکان.

## سێیەم -دەسهاتی گشتی Public Revenue

دەسهاتی گشتی (بریتییە لەو دەرامەتە ئابوورییەی کە دەوڵەت لە شێوەی کەڵەکە بوونی دارایی بە دەستی دەهێنی بە مەبەستی دابینکردنی خەرجی گشتی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە گشتییەکان). بەمەش دەسهاتی گشتی بە بەشێکی گرنگ و تەولوکەری پارەدارکردنی خەرجی گشتی دادەندرێ.

دەسهاتی گشتی لەگەڵ پێشکەوتنی هێزی ئابووری و دارایی بەرەو پێشەوەچوو و کلاسیکەکان (ئابووریناسە کۆنەکان) پێیان وابوو دەسهاتی گشتی (بریتییە لە چۆنیەتی پڕکردنەوەی خەزینەی گشتی بە دەرامەتی پێویست لە پێناو دابینکردنی خەرجییە گشتییەکان بۆ ئەوەی دەوڵەت بە ئەرکە سەرەکییەکانی خۆی هەڵسێ). بەڵام لە سایەی قوتابخانەی نوێدا بۆتە ئامرازێکی گرنگ لە ئامرازەکانی رامیاری دارایی ، وجگە لە ئەرکە داراییەکەی میری بۆ ئەوەی کاریکاتە سەر چالاکی ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان بەکاری دێنێ.

میری پشت بەسەرچاوەی جیاواز وهەمەجۆر دەبەستی بۆ بەدەستهێنانی دەسهاتی گشتی کە گرنگییەکەی جیاوازە لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر بەگوێرەی ئەو سیستەمە ئابوورییەی پەیڕەوی دەکا تا چەند پێشکەوتووە، وئەو سیستەمە رامیاریەی هەیە وماوە وکاتەکەی دەگۆڕێن.

## جۆرەکانی دەسهاتی گشتی:

### یەکەم - دەسهاتی موڵکی دەوڵەت:

بریتییە لەو دەسهاتەی کە دەوڵەت لە موڵکەکانی خۆی و پرۆژە ئابوورییەکانی دەستی دەکەوێ، ئەم جۆرەش بە سەرچاوەیەکی گرنگی زۆریەی دەسهاتی گشتی ولاتان دادەنرێ بە تایبەتی ولاتە تازە پێگەیشتووەکان.

پێویستە مۆڵکەکانی دەوڵەت لەڕووی یاساییەوە دابەش بکەین بۆ:

١-ئەو موڵکانەی دەکەوێتە ژێر حوکمی یاسای گشتی (دۆمینی گشتی) :

نموونە ئەو موڵکانە وەك: ڕێگا و پرد وگۆڕەپان و باخچە گشتییەکان وموزەخانە... هـ تد، ئەو شمەك و خزمەتگوزاریانە دەگرێتەوە کە تایبەتە بە سوودی گشتی بەبێ هیچ بەرامبەرێك ولتە بە خۆڕایین، بەڵام لە بارودۆخی (نائاسایيدا) دەوڵەت ڕەسم دەسەپێنێ بۆ چوونە ژوورەوەی موزەخانە وبەکارهێنانی باخچە و ڕێگا خێراکان وپەڕینەوە لە پردەکان و دەسهاتی ئەم ڕەسمانە بۆ پێشخستن و باش کردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان تەرخان دەکرێ وناچێتە گیرفانی دەوڵەت وئەم جۆرە دانانرێت بە سەرچاوەیەك لەسەرچاوەکانی دەسهاتی دەوڵەت.

٢-ئەوموڵکەکانی دەکەوێتە ژێر حوکمی یاسای تایبەت:

زانایانی دارایی گشتی ئەم موڵکانە بە بابەتێکی گرنگ دادەنێن و بە سەرچاوەیەکی گرنگی دەسهاتی گشتیش دەژمێردرێ و ئەم جۆرە لە موڵکەکانی دەوڵەت بەکاردەهێنرێ بۆ بەکارخستنی ئابووری و بەدی هێنانی دەسهات وەکو زەوی خانوو بەرە و پرۆژەی پیشەسازی و بازرگانی لە دەرامەت و سامانەکانی کاغەزە داراییەکان (الاوراق المالیە)، دەتوانین دەسهاتی دەوڵەت دابەش بکەین بە گوێرەی خاوەندارێتی سروشتی سەرچاوەی دەسهات .

دەسهاتی موڵکەکانی دەوڵەت دابەش دەبێ بۆ :

أ - دەسهاتی دەرامەتە سروشتییەکان و سامانی خانوبەرە:

مەبەست لە سەرچاوە سروشتییەکان، زەوی کشتوکاڵی و دارستان و رووبار و کانزاکان کە لە ناو جەرگەی زەویدا هەن ، بەلآم سامانی خانووبەرە بریتییە لە زەوی و زار و خانووبەرەی نیشتەجێبوون کە دروست کراون بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نیشتەجێبوون و ئەو موڵکانەش دەسهات بۆ دەوڵەت بەدەست دەهێنن و دەچنە خەزێنەی دەوڵەت.

موڵکی دەوڵەت لە زەوی بەکۆنترین موڵکی گشتی دادەنرێت، ئەو زەویانە کە بەر لە دەرکەوتنی دەوڵەت لە لایەن کۆمەڵگەوە بەرێوەدەبران، دوای دەرکەوتنی دەوڵەت ئەو موڵکانە بوونە موڵکی دەوڵەت، بە تێپەربوونی رۆژگاریش موڵکەکانی دەوڵەت لە زەوی وزار کەمبوونەوەو ،تاکەکان بەشێکی زۆریان کەوتە ژێردەستی لە پێناو سوود لێ وەرگرتنی.

ب – دەسهاتی دەوڵەت لە پرۆژە پیشەسازی و بازرگانییەکان:

پـرۆژە پیشەسـازی و بازرگانییـەکان دەسـهاتێکی گـرنگ بـۆ دەوڵـەت دەسـتەبەر دەکـەن، وئەمـەش لـە رێگـەی گرنگـی دان بـە بـوارە جـۆر بـەجۆرەکانی بەرهـەمهێنان ودام ودەزگـای بەرهەمـداری، لـەو پرۆژانـەش پرۆژەکانی گواستنەوە بە شەمەندەفەرو کارەبا و گازو بانکەکان.

ج – دەسهاتی دەوڵەت لە دەرامەتە داراییەکان:

مەبەسـت لـە دەرامـەتی دارایـی جانتـای دەوڵەتـە لـە پشـك وقەباڵـەکان کەدەسـهاتێکی دارایـی بـۆ دەسـتەبەر دەکـات وەکـو قـازانج لـە کـرین وفرۆشتنی کاغەزە داراییەکان لە بازاڕی داراییدا و ئەو سووی قەرزیش کـە لە تاك و دەزگاکان وەری دەگریٚ، ئەو سووی ئـەو پارانـەی کـە دەوڵـەت بانکەکانی دایناوە.

## دووەم – باج Taxation

باج یەکێکە لە سەرچاوە پێشەنگەکانی دەسهاتی گشـتی، دەوڵـەتان هـەر لـە کۆنەوە پشتیان پیٚ بەستووە بۆ دابینکردنی خەرجی گشتی بەهەر شـێوازێك بێت.

باج پێناسە دەکرێت کە:

– سـەپێنراوێکی نەختینییـە کـە دەوڵـەت بـە زۆرەملـیٚ بـە سـەر تاکـەکانی کۆمەڵگـە بـەبیٚ بەرامبـەر دەیسـەپێنێت لـە پێنـاو پڕکردنـەوەی خـەرجی گشتی و بە دەستهێنانی ئەو ئامانجانـەی هـەڵقوڵاوی فەلسـەفەی سیاسـی دەوڵەتن.

**ئامانجەکانی باج:**

**باج هەوڵدەدات بۆ دەستبەرکردنی ئامانجی جۆرلوجۆر بە پێی هزری (بیری) دارایی:**

أ – ئامانجی دارایی:

**ئامانجی دارایی باج بریتییە لە دەستەبەرکردنی دارایی بۆ پڕکردنەوەی خەرجییە گشتییەکانی دەوڵەت کە پێویستە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی، وئەم ئامانجە ئامانجی کۆن (کلاسیکی) باجە.**

ب – ئامانجی ئابووری:

**باج بەپێی هزری دارایی ئەم هاوچەرخ دەکرێت ئامرازێکی لە بار بێ بۆ هێنانەدی ئامانجە ئابوورییەکان، لە تەرخانکردن و دابەشکردن و وسەقامگیری وپەرەسەندن.**

ج – ئامانجی کۆمەڵایەتی:

**باج بۆ بەدیهێنانی ئامانجی کۆمەڵایەتی بەکاردێت وەك دووبارە دابەش کردنەوەی داهات و سامانەکان، و چارەسەرکردنی کێشەکانی بێ جێگەیی نیشتەجێبوون و پەرەپێدانی لادێ، ودژایەتی کردنی هەندێك دیاردەی نەشیاو بەواتا باج بەکاردێت بۆ:**

**١– دووبارە دابەشکردنەوەی داهات ولەپێناو کەمکردنەوەی جیاوازی لە نێوان داهاتەکان.**

**٢– بەرەوپێشەوە بردنی کۆمەڵگە، لێرەدا بەکاردێت بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی .**

**٣– چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگە وەك کەمی خانوو بۆ نیشتەجێبوون، بە هۆی سەپاندنی باجێکی زۆر لە سەر باڵەخانەی بەتاڵ و لێخۆشبوون لە بەشێك یاخود هەموو باجەکە لەسەر کەرتی وەبەرهێنانی خانووبەرە.**

**جۆرەکانی باج:**

**یاسا دانەری باج یاخود یاسادانەری ئەو ماددانەی دەچنە ژێر بابەتی (دەفری) باج و ئەو قەبارانەی باج دەیانگرێتەوە، پاش ئەوەی یاسا دانەر ئەو ماددانە هەڵدەبژێری، پێویستە پشت بە شێوازێکی دیاری کرلو ببەستن لەدیارکردنی نرخی باج وچۆنیەتی باجەکەش بخەملێنری وشێوازی وەرگرتن و لێکۆڵینەوە لەبارەی دیاردەی خۆدزینەوە لە باج و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی و کەم کردنەوەی.**

- دەفری باج: **بریتییە لەو ئەندازەیەی کە ( بابەت وماددەی باج لە سەری دەسەپێنرێت) لەکاتی ئێستادا بریتییە لە سامان، دەفری باج لەگەڵ سەرچاوەی باج جیاوازی هەیە.**
- سەرچاوەی باج: **بریتییە لەو سامانەی کە بەهۆی باجەوە دەدرێ واتە ئەوەی دەکەوێتە ژێر سنووری باجەوە، هەرچی (سەرچاوەی سەرەکیە) ی باج بریتییە لە داهات بەوپێیەی باج سەپێنراوێکە بەردەوام لە نوێ بووندایە. دواتر لە سامانی نوێ وەردەگیرێ و جاروباریش گەر داهات توانای کەم بوو ئەوا لە سەرمایە وەردەگیرێ.**

**بە واتا دوو جۆرە باج هەیە یاخود میری بەدوو رێگە باج لە داهات و سامان وەردەگرێ:**

- **باجی راستە وخۆ Direct Tax**
- **باجی نا راستەوخۆ Indirect Tax**

**نرخی باج:** The Tax Rate

ئەوەی لە دەفری باج وەردەگیرێ بەنرخی باج دادەنرێ ، نرخی باج بریتییە لە ڕێژەی باج لە دەفری باجەکە. نرخی باج بە دوو قۆناغدا تێدەپەڕێ، بریتین لەمانە :

**١ - قۆناغی باجی دابەشکراو:**

یاسا دانەری باج لەو قۆناغە بڕی باجەکە دیاری دەکات، ئینجا جوگرافیانە بەپێی پارێزگاکان دابەشی دەکات ، ئابوورییانەش بەپێی توانای تاکەکانی ئەم پارێزگایانە دیاری دەکات.

**٢- قۆناغی باجی پێوانەیی:**

لەم قوناغەدا سێ جۆری باج بەدی دەکرێ وەك باجی ڕێژەیی ، وباجی هەڵکشاو، و باجی داکشاو .

باجی ڕێژەیی: نرخی ئەم جۆرە نەگۆڕە ، هەر چەندە بنەمای (دەفری باج) باج زیاد وکەم بێت.

باجی هەڵکشاو: ڕێژەی باج زیاددەکات بە پێی زیاد بوونی بنەمای باجەکە.

باجی داکشاو: نرخی ئەم جۆرە نزم دەبێتەوە بە زیادبوونی بنەمای باجەکە.

**خۆ لە باج لادان و ڕاکردن لە باج:** And Tax Evasion Tax Avoidance

کەسێکی ئاسایی یان مەعنەوی کە باجی دەکەوێتە سەر، دەیەوێ ئەرکی سەر شانی لە باجدان کەم بکاتەوە دەبێ بە زۆر بیدات لە کاتی دانی باج خۆی دەدزێتەوە بۆیە پشت بەهەموو ڕێگایەك دەبەستێت تا باج نەدات، ئەگەر ئەو هۆکارانە ڕەوا بوون باجدەر خۆی لێ بدزێتەوەو ئەوە پێی

دەوترێت **(خۆ لە باج لادان)** Tax Avoidance، و ئەگەر هاتوو ئەم ڕێگایانە ڕەوا نەبوون پێی دەوترێت ڕاکردن **(خۆ دزینەوە)** لە باج Tax Evasion.

لە هەمان کاتدا ڕاکردن (خۆ دزینەوە) لە باج پێناسە دەکرێت بە:

- گوێ پێ نەدان بە یاسای باج .
- نەدانی باج یان دواخستنی بەبێ هیچ پاساوێك .
- باجدەر هەوڵدەدات تەواوی باج یان بەشێکی نەدات پاش ئەوەی دەرکەوتووە کە دەبێت باج بدات .

ڕاکردن لە باج زۆر شێوەی هەیە، کە ئەمانە هەندێکیانن :

١- دواکەوتن لە کردنەوەی فایلی باج.

٢- دان پێنەنانی باج.

٣- زێدەڕۆیی لەو بڕە پارانەی کە دەبێت کەم بکرێتەوە.

٤- ئاودیوکردن (تهریب).

٥- گەندەڵی.

٦- شاردنەوەی ئەو پارانەی کە دەچنە ژێر ڕکێفی باج.

لەمانە دەردەکەوێت ڕاکردن لە باج پرۆسەیەکی ناپەسەند و فراوان وری بزرکردنە بەسەر دەقە یاساییەکان بە ئامانجی نەدانی ئەو بڕەی کە لە ئەستۆی (ذمة) باجدەر دایە وەکو باج .

**سێیەم – ڕەسم(میرانە): Duties**

(بڕێك پارەیە كە دامەزراوەكانی دەوڵەت لەبەرامبەر خزمەتگوزارەیەك پێشكەشی دەكات وەریدەگرێت)، ڕەسم بەگوێرەی ئەو بەرەو پێش چوونەی كە لە دارایی دەوڵەتدا ڕوویداوە بەشێوەی نەختینە وەردەگیرێت، بەمەش ناكری ڕەسم بەشێوەی زیندەماڵ یاخود بۆ ماوەیەك لەلای كار بكات لەجیاتی ڕەسم بدرێتە دەسەڵاتی دارایی، هەروەها ڕەسم بەوە دەناسرێتەوە كەبەزۆرەملێیەو دەتوانین جیاوازی لەنێوان دوو جۆر سەپاندنی ڕەسم بكەین:

**أ– سەپاندنی یاسایی:**

ئەم سەپاندنە كاتێك دەبێت كە تاك بەگوێرەی یاسا ناچار دەكریٚ بۆ وەرگرتنی خزمەتگوزاری وەكو خوێندنی بەزۆری و پێویستە ڕەسمی پەروەردەیی بدات.

**ب- سەپاندنی مەعنەوی:**

ئەو ڕەسمە لەسەر خواستی كەسێك وەردەگیرێت كە داوای خزمەتگوزارییەك دەكات، بۆ وەرگرتنی ئەم خزمەتگوزارییە هیچ ناچاریەكی(زۆرەملیٚ) یاسایی تێدا نییە، بۆ نموونە بەدەستهێنانی خزمەتی خوێندنی زانكۆ، ڕەسمەكە بەزۆری وەردەگیری، ڕەسم بەرامبەر پاداشتێك وەردەگیریٚ كە حكومەت پێشكەشی دەكات، ئەم خزمەتگوزارییە چەند جۆرێكی هەیە وەكو هەوڵدانی فەرمانبەرێك بۆ مۆركردنی بەڵگەنامەیەك یان گرێبەستێك، یاخود بەگوێرەی یاسا دەبەخشرێتە كەسێك وەكو مۆڵەت وەرگرتنی شوفێری وبینا دروستكردن.

### چوارەم – قەرزی گشتی: Public Loans Borrowing

پێناسەیەکی زۆر بۆ قەرزکراوە دەتوانین بەم شێوەیە پێناسەی بکەین:
**(گرێبەستێکە کە دەوڵەت و یان یەکێك لەدامەزراوە گشتییەکان لەگەڵ جەماوەر یان لەگەڵ دەوڵەتێکی دیکە دەیبەستێ و پەیمان دەدات بە دانەوەی بڕی قەرزەکە وسوودەکەی تا ماوەی قەرزەکە تەواو دەبێ، ئەمەش بەگوێرەی ئەو فەرمانەی کە لەلایەن دەسەڵاتی تایبەتییەوە دەردەچێ).**

### قەرزی گشتی و گرێبەست:

لە هەموو گرێبەستێك دوولایەن هەیە و گرێبەستی قەرز وەکو لایەنی یەکەم دەوڵەتە یان یەکێك لە دامەزراوە گشتییەکانە، ئەو لایەنەی قەرز وەرگرە، ولایەنی دووەم جەماوەرە (خەڵك) یان دەوڵەتێکی تر، ولایەنی قەرزدەر لایەنی یەکەم پەیمان دەدات بە دانەوەی بڕی قەرزەکە لەماوەو کاتی خۆیدلو پێدانی سووی قەرز تا ماوەکەی تەواو دەبێت، بەڵام لایەنەکەی دیکە پەیمان دەدات پێدانی قەرزەکە بەلایەنی یەکەم.

### جیاوازی لە نێوان قەرز و باج:

قەرزو باج هەردووکیان لەیەکتری نزیکن، چونکە سەرچاوەیەکن لەسەرچاوەکانی دەسهاتی گشتی ، بەڵام لەمانەی خوارەوەدا جیاوازن :

١- تەرخانكردن:

یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی باجی كۆن (ئاسایی) ئەوە بوو دەسهاتەكە تەرخان نەكرابوو بەولتا بۆ جۆرە خەرجیەك تەرخان نەكرابوو بە پێچەوانەوە قەرز كردن دەسهاتێكە بۆ خەرجیەكی تایبەت تەرخان دەكرێ.

٢-بەرامبەری (مقابل):

باج سەپێنراوێكی بێ بەرامبەرە، كەچی قەرز لە بەرامبەریدا سووێكی دیاریكراوی هەیە وەك وەرگرتنی سووی قەرزەكە لەو كەسانەی قەرزەكە وەردەگرن.

٣-ویست (الأرادە):

باج بەتەنها ویستی دەوڵەت لەسەر بنەمای هاوكاری كۆمەڵایەتی دادەنرێت، لە كاتێكدا قەرز لەسەر بنەمای گرێبەست و رێككەوتنە.

٤-سروشتی دەسهات:

باج دەسهاتی كۆتایی دەوڵەتە، بەڵام قەرز دەسهاتێكی كاتی دەوڵەتە تەنها لەكاتی تەولوبوونی ماوەی قەرزەكە وەردەگیرێت، لە كاتێكدا كە باج تەنها لەكاتی وەرگرتنی كاریگەری لەسەر دەسهات دەكات، بەڵام قەرز كاریگەری لەسەر لایەنی دەسهاتی بودجە دەكات لەكاتی وەرگرتنی و، كاریش دەكاتە سەر لایەنی خەرجی لەكاتی دانەوەی قەرزەكە.

**جۆرەکانی قەرز:**

قەرز دابەش دەکرێ بۆ چەند جۆرێك :

یەکەم - بە گوێرەی ماوەی کاتی (درێژ، مام ناوەندی ، کورت):

قەرزی کورتخایەن: بەم قەرزە دەگوترێ قەرزی بەردەوام، ئەم قەرزە ماوەکەی کورتەو لەساڵێك تێناپەڕێ، دەوڵەت ئەم قەرزە بۆ چەند مەبەستێك دەکات:

کەمبڕستی نەختینەیی: کە لە ماوەی ساڵێکی داراییدا روودەدات ، لەم حاڵەتەدا دەوڵەت هەڵدەستێ بەدەرکردنی قەباڵەی گەنجینەی گشتی.

کەمبڕستی دارایی: بریتییە لە زیادبوونی خەرجی لە چاو دەسهاتەکان، بۆیە دەوڵەت بۆ چارەسەرکردنی هەڵدەستێ بە دەرکردنی قەرز بۆ ماوەیەکی کورت بە هۆی ئەو بارودۆخەی کە لەبازاڕی داراییدا هەیە، لەم حاڵەتەدا دەوڵەت قەباڵەی گەنجینەی نا ئاسایی دەردەکات.

قەرزی ناوەندی و قەرزی درێژخایەن: هیچ جیاوازیەکی ورد لە نێوانیاندانییە لەلایەنی درێژی ماوەکەی دەتوانین بڵێین قەرزی مام ناوەندی ماوەکەی لە نێوان ساڵێك و(٥ — ٧)ساڵ دایە و هەندێ جار دەگاتە ١٠ساڵ، بەلآم قەرزی درێژخایەن ماوەکەی لە ماوەی قەرزی مام ناوەندی درێژترە ولەم ماوەیە تێدەپەڕێت. هەردەم بۆ ئەم پێداویستیانەبەکاردێت:

١- بۆ پارەدارکردنی پرۆژەکانی گەشەسەندن و پەرەپێدانی ئابووری .

٢- پارەدارکردنی خەرجی جەنگ و پڕکردنەوەی هەندێ خەرجی بەرگری نیشتمانی.

قەرزی ماوە کورت پێشی دەڵێن قەرزی کاتەکی یان بۆ بەکاربردن، بەهەردوو قەرزی (مام ناوەندی وماوەدرێژ) دەگوترێ قەرزی هەتا هەتایی یاخود چەسپاو.

دووەم – قەرز بەگوێرەی سەرچاوە (ناوخۆی و دەرەکی):

قـەرزی نـاوخۆ: بریتییـە لـەو قـەرزەی کەدەوڵـەت لـە ڕێگـەی دەرکردنـی قەباڵەکان، لە کەسانی ئاسایی یان مەعنەوی وەریان دەگرێت واتـا قەرزەکـە لە بـازاڕی نـاوخۆی دەوڵـەت دەکرێ. بـە قـەرزی نـاوخۆ دەگـوترێ (قـەرزی نیشتمانی)، کە بۆ ئەم مەبەستانە بەکاردێت:

١–ڕووبەڕووبونەوە و پارەدارکردنی خەرجیەکانی جەنگ.

٢–پارەدارکردنی پرۆژەکـانی نۆژەنکردنـەوە و بونیادنانـەوەی دامـەزراوەکان کە بەر کارەساتی سروشتی یان جەنگیەکان کەوتوون.

٣– کەمکردنەوەی قورسایی قەرزی گشتی دەرەکی لەسەر شانی دەوڵەت.

قەرزی دەرەکی: بریتییە لەو قەرزانەی دەوڵـەت لـە کەسـانی ئاسـایی یـاخود دەوڵەتانی دیکە وەری دەگرێت، ئەم قەبالأنـەش لـە بـازاڕی دارایـی دەرەکـی دەردەکرێ .

**گرێبەستی قەرزی دەرەکی بە هۆی:**

١–کاتێـك پاشـەکەوتی نـاوخۆ(خۆماڵییـەکان ) یـاخود سـەرمایەی نـاوەخۆ نەتوانێ پرۆژەکانی بەرهەمهێنان دابمەزرێنێ.

٢–کاتێـك دەسـهاتەکانی دەوڵـەت لـە پـارەی بیـانی نـەتوانێ چـارە سـەری لاسەنگی تەرازووی پارەدان بکات.

سێیەم– بە گوێرەی شێوازی قەرزدانەکە(بەئارەزوو، زۆرەملێ):

بنەمای ئارەزوومەندی جیاوازییەکی بنەڕەت لە نێوان باج و قەرزە کاتێك بنـەڕەتی گەڕانەوەی بۆ قەرزی ئارەزوومەندانە.

أ- قەرزی ئارەزوومەندانە: ئەو قەرزەیە کە دەوڵەت بڕەکەی و مەرجەکانی (سوو) وماوەی دانەوەکەی ئاشکرا دەکات ئینجا سەرپەستی بە خەڵك دەدرێ کە بە ئارەزووی خۆی قەرز بدات یان نەیدات.

ب- قەرزی زۆرەملیّ: ئەو قەرزەیە کە دەوڵەت بە پێی ئەو دەسەلآتەی کە هەیەتی بە زۆرەملیّ لەخەڵکی وەردەگرێت بەبیّ رەزامەندی کەسەکان، واتە خەڵك ناچار دەکات بە قەرزدان.

**رۆڵی سەرچاوەکانی داهات:**

**یەکەم: ڕۆڵی باج لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان:**

لە سەر رامیاری دارایی پێویستەگرنگی رۆڵی باج دیار بکات، پێویستە باج کار بکات بۆ کەمکردنەوەی بەکاربردن و پێکهێنانی پاشەکەوت و هاندانی وەبەرهێنانی تایبەت و پاراستنی پیشەسازی نیشتمانی.

هەروەها دەوڵەت دەتوانیّ لە هەندیّ پرۆژەی وەبەرهێنان خۆش بیّ، بەمەبەستی هاندانیان ،کە دەوڵەت بەکارێکی پێویست وگرنگی دەزانیّ لە بواری پەرەپێدانی ئابووریدا ئەو باجەی لە سەر داهات سەپێنرلوە وەرنەگریّ یاخود لە رەسمی گومرگی سەر ئەو شمەکانە خۆش بێت، رەسمی گومرکی پیشەسازی نیشتمانییە تازە دامەزرلوەکان Infant Industry دابین دەکات لە بەرامبەر کەل وپەلی پیشەسازی بیانی، ئەمەش بازاڕی ناوخۆ فراوان دەکات لەبەردەم پیشەسازی نیشتمانی (هەرچەندە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بۆ پاراستنی دژایەتی دەکات).

دووەم – کاریگەری (شوێنەواری) ئابووری قەرزی گشتی:

١–قەرزی گشتی دەبێتە هۆی دووبارە دابەشکردنەوەی داهاتی نەتەوەیی لە نێوان بەکاربردن و پاشەکەوتکردن، کە لە بەرژەوەندی پاشەکەوتکردنە چونکە هانی ئەو کەسانە دەدات کە پاشەکەوتی بچوکیان هەیە پاشەکەوت بکەن.

٢–ئەو قەرزەی کە بانکەکان دەیدەنە دەوڵەت رێژەی قەبارەی نەختینەیی لە دەستاودەست کرلو زیاددەکات، ئەمەش ئاسەواری(شوێنەواری) هەڵاوسانیی Inflationary Effects خراپی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان لێ دەکەوێتەوە هەروەها لەو وڵاتانەی کە لە باری خستنەگەری تەواویدان.

٣– قەرزی گشتی کاریگەرییەکی گرنگی لە سەر ئاستی داهاتی نەتەوەیی دەبێت (جا چ لە حاڵەتی خستنەگەڕی تەواوبن یان نا) ، ولەسەر سروشتی خەرجی گشتی کە ئەم قەرزەی بۆ کرلوە.

٤–بە فراوانبوونی قەرزی گشتی، کاردەکاتە سەر پەرەسەندنی بازاڕی نەختینەیی و دارایی وپەرەسەندنی ئەو بازاڕەش هۆکارێکی گرنگ و سەرەکییە لە هۆکارەکانی پەرەپێدانی ئابووری لە میانەی ئابووری بازاڕدا.

پێنجەم: کاریگەری ئابووری پارەی تازە دەرکراو:

سکەلێدان (الاصدار الجدید Issue ): بریتییە لە دەرکردنی پارەی نوێ، ئەم پارە نوێیەش کار لە زیادکردنی هۆکارەکانی پارەپێدان (وسائل الدفع) دەکا، دواجار خواستی هەمووەکی لەسەر شمەکی بەکاربردن زیاد دەکات،

خستنەرووی ئەم شمەکانەش لە ئاستی ئەم زیادە بەکاربردنە نییە، ئەمەش وا دەکات نرخەکان روو لە بەرزبوونەوە بکەن و هێزی دراو روو لە نزمبوونەوە بکات و ئەمەش دەبێتە هۆی:

١-بەرزبوونەوەی تێچوونی بەرهەمهێنان.

٢-بەرزبوونەوەی نرخی هەناردەکان و دروستبوونی کۆسپ لە بەرامبەری.

٣-دابەزینی بەهای دراو لە دەرەوە.

٤-بەرزبوونەوەی نرخەکانی هاوردە و زیان گەیاندن بە تەرازووی پارەدان.

سەبارەت بە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو کە خاوەنی ئامێرە نوێی بەرهەمهێنان نین هەمان شتە، زیادبوونی بڕی دراو کاریگەری لەسەر خواستی هەمووەکی دەبێت بەبێ زیادبوونی بەرهەمهێنان، واتە ئامێرەکانی بەرهەمهێنان ناتوانن زیادبوونی خواستی هەمووەکی پڕبکەنەوە.

بۆ ئەوەی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان سوود لە پارەی تازە دەرکراو وەربگرن بۆ پارەدارکردنی گەشەپێدانی ئابووری ، دەبێت دوو مەرجی سەرەکی هەبێت :

یەکەمیان: پارەی تازە دەرکراو دەبێ بۆ وەبەرهێنان تەرخان بکرێت تا وەکو شمەکی بەکارهێنەکی بەرهەم بهێنرێت ، بەو مەرجەی نابێت ماوەی بەرهەمهێنان درێژبێت.

دووەمیان: پارەی تازە دەرکراوەکە دەبێت بەبڕی بچووك و لەیەکتر نزیك نەبێت.

ئەمەش مانای وایە وڵاتە تازە پێی گەیشتووەکان ناتوانن بە شێوەیەکی فراوان پارەی تازە دەربکەن بۆ گەشەپێدانی ئابووری ، چونکە پەنا بردنە بەر ئەو کارە مەترسییەکی گەورەی بە دواوەیە .

**چوارەم: بوجەی گشتی** Public Budget

**بوجـەی گشـتی** Public Budget **رەنگدانـەوەی فەلسـەفەی ئـابووری هـەر سیستەمێکی ڕامیارییە. بودجەی گشتی هاوشان لەگەڵ پێشکەوتنی دەوڵەت و بیری (هزری) ئابووری پێشکەوتووە .**

**بوجەی گشتی پێناسە دەکرێت:**

- بوجەی گشتی : (**بەڵگەنامەیەکی خەملاندنی خەرجیەکانی دەوڵەت و دەسـهاتەکەی بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو کـە ماوەکـەش زۆر جـار ساڵێکە، خەملاندنی بوجەش لە ژێر ڕۆشنایی فەلسـەفەی دەسـەڵات دەبێت**) .

**بودجە هەر تەنها ئامرازێکی دارایی نییە ، بەڵکو ئامرازێکە دەوڵەت لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی رامیاری دارایی بەکاری دێنێت کە لە پێناو سەقامگیری ئابووری و گەشەپێدانی ئابووری بەکاری دێنێ تاکو پاشەکەوت رێکبخا و بەکاربردن ئاراستەبکرێت و توانای تاکە کەس و ئارەزووی بۆ کار بەرزکاتەوە .**

بودجەی گشتی لە سەر دوو پێگە وەستاوە ، بریتین لە :

١- خەملاندن: خەملاندنی بڕی ژمارەی چاوەڕوانکراو کەلە هەموو سەرچاوەکان بەدەست دێت، هەروەها لایەنی خەرجی گشتی لە ماوەی داهاتوودا کە (یەک ساڵە).

٢ - ڕێپێدانی دەسەڵاتی یاسادانان: یا ئەوەی ڕێگەی پێدراوە بۆ یاسادانان واتا لە لایەن دەسەڵاتی یاسادانان یا ئەو دەسەڵاتەی ڕێگەی پێدراوە بودجەی گشتی پەسەند بکرێ.

## ڕێسا گشتییەکانی بودجەی گشتی:

پێویستە لەکاتی ئامادەکردنی بودجەی گشتیدا، ڕەچاوی چەند ڕێسایەکی گشتی بکرێ کە یاسای زانستی دارایی گشتیدا هەیە، ڕێساکان ئەمانەن :

١. ڕێسای یەکبوون:

پێویستە یەك بودجە دابنرێت ولەم بودجەیەدا هەموو خەرجیەکانی دەوڵەت و هۆیەکانی پارەدارکردنی تیایدابێت بەواتا دەوڵەت یەك بودجەی گشتی هەبێت تا بە ئاسانی پلانی دارایی دەوڵەت( بەچاو لێکردنێك بزانرێ)، چونکە بودجەی زۆر کاری پیشاندانی بنەماکانی بودجەکە بەشێوەیەکی روون بەدیار ناخات و ژماردنەکە تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت.

٢. سەرلەبەری (گشتگیری) بودجە:

ئەم ڕێسایە لەسەر ئەم بنەمایە وەستاوە کە شێوازی بودجەی پوخت پەیڕەو نەکرێت، واتە برین لەنێوان خەرجی و دەسهاتە گشتییەکان نەکرێت. بە واتا هەموو خەرجییەکان وهەموو دەسهاتەکانیش بەبێ لێدەرکردن بنووسرێن، ئەمەش چالاکی دەسەڵاتی گشتی وەك خوێ دەردەخات و دەسەڵاتی یاسادانانیش دەتوانێ چاودێری ئەم جێبەجێ کردنەی بودجە بکات .

٣. ڕێسای تەرخان نەکردن:

ئەم ڕێسایە بریتییە لەوەی کەنابێت دەسهاتێکی دیاری کراو بۆ خەرجیەکی دیار کراو تەرخان بکرێت، بەڵکو تەواوی دەسهاتەکان لە لایەك کۆ دەکرێتەوە و لە بەرامبەری دا لە لایەکەی تر هەموو خەرجییەکان دیاری دەکرێ ، کە هەموو خەرجیەکانی تایبەت بە ساڵی دارایی دەگرێتەوە.

٤. ساڵانەیی بودجە:

واتە ئەو ماوەیەی کە بودجە لە خۆ دەگرێ بریتییە لە یەك ساڵ، نابێت مەرج دابنرێت ئەو ساڵە لەگەڵ ساڵی زایینی بێت، بەڵکو ساڵەکە بەپێی بارودۆخی هەر دەوڵەتێك دەستنیشان دەکرێت، ئەوەی تێبینی دەکرێت سەرەتای ساڵی دارایی لە نێوان دەوڵەتێك بۆ دەوڵەتێکی تر بە پێی سیستەمی یاسادانانی و کارگێڕییەکەی جیاوازیان هەیە.

٥. هاوسەنگی بودجە:

مەبەست لە هاوسەنگبوونی بودجەی گشتی ئەوەیە نابێت دەسهاتە گشتییەکان لە خەرجییە گشتییەکان زیاتر بێت و بە پێچەوانەوەشەوە، بەواتا کاتی بودجە هاوسەنگ دەبێ کە دەسهات و خەرجی یەکسان بن، ئەگەر لە بارێکدا دەسهاتەکان لە خەرجیەکان زیاتر بوو یاخود لەکاتی ناهاوسەنگیدا کە خەرجیەکان لە دەسهاتەکان زیاتر بوو ئەوە کورتهێنان (عجز) دێتە ئاراوە. لەم بارەشدا دەوڵەت ناچارە پەنا بۆ قەرزی ناوەوە و دەرەوە ببات بۆ ئەوەی ئەم کورت هێنانە چارەسەر بکات ، ڕەنگە یەدەگەکانی بەکاربێنێت یاخود پەنا بۆ هۆکاری دیکە وەك (دەرکردنی پارەی تازە) ببات.

ڕێکخستنی بودجه:

بودجه به قوناغی جیاجیا تێدهپهڕێت تا دهگاته کۆتایی ساڵی دارایی که بهگوێرهی پلانێك خهملێندرلوه، دواتر گفتوگۆ لهسهر ههموو ئهو کاروبارانه دهکرێت که دهبێت له ماوهی ساڵی دارایی ئاماده بۆکراو به دهست بێنێت، به گشتی بودجه بهم قوناغانه تێدهپهڕێت : (قۆناغی ئامادهکردن و خۆسازدان، قۆناغی هەڵسهنگاندن و پهسهندکردن ، قۆناغی جێبهجێکردن، قۆناغی چاودێری و پێداچوونهوه).

١- قۆناغی ئامادهکردن و خۆسازدان:

ئامادهکردن و سازکردنی بودجهی گشتی له ئهستۆی دهسهڵاتی جێبهجیٚ کردنه، لهم قۆناغه وا پێویسته دهسهاتی گشتی پێشبینی کرلو و خهرجی گشتی پێشبینی کرلو بۆ ماوهی ساڵی دارایی داهاتوودا دیاری بکری.

بیانووی زۆر بۆ ئهم کاره ههیه:

أ- بهدیهێنانی ئامانجی ئابووری و کۆمهڵایهتی له ئهستۆی حکومهته، که ئهمهش پێویستی به پرۆگرام سازی و رامیاریهکی گونجاو ههیه بۆ بهدیهێنانی بهم ئامانجه ، وبۆ جێبهجێکردنی ئهم پرۆگرام و رامیاریه و ئهرکانهی سهرهوه پێویستی به پارهدارکردنی پێویست ههیه بۆ سهرکهوتنی کارهکهی.

ب- حکومهت ئامێر و توانی هونهری و بهڕێوهبردنی بههێزی ههیه بۆ دیاریکردنی توانای کهرت و چینهکان له ههڵگرتنی قورسایی داراییدا و ئهمهش وا دهکات سهرچاوهکانی دهسهات دیار بکریٚ .

ج- حکومهت دهتوانیٚ پێویستییهکانی کۆمهڵگه بزانیٚ بۆیه کاری ئامادهکاری لهئهستۆ دهگریٚ و ئامادهکردنی خهملاندنی (که

لەبچووكترین (كەم دەسەلاتترین دامەزراوی حكومەت دەست پێ دەكات) دا كە دەبێت پابەند بێت بە خەرجی گشتی و پێشبینی بۆ دەسهاتی خەملێنراو بكات لە ماوەی ساڵی دارایی پێویست لە ئامادەكردنی بودجەدا.

٢- قۆناغی هەڵسەنگاندن و پەسەندكردن (رێگەپێدان):

دوای ئامادەكردنی پرۆژەی بودجەی گشتی، ئەنجومەنی وەزیران پرۆژەكە دەخاتە بەردەم دەسەلاتی یاسادانان، كە ئەویش هەڵدەستێ بەرەوان كردنی بۆ هەڵسەنگاندنی لیژنەی دارایی كە لە چەند ئەندامێكی پەرلەمان پێك هاتووە، كە ئەوانیش پێشنیارەكانیان بۆ دەسەلاتی یاسادانان بەرز دەكەنەوە بۆ پەسەندكردنی بودجەكە، پاشان پێشنیار لەسەر بەشەكان و بودجەكە بەتەواوی دەكرێت بۆ ئەوەی ببێتە یاسایەك، بەمەش بودجەكە رێگەی پێدەدرێ جێبەجێ بكرێ .

٣- قۆناغی جێبەجێكردن :

مەبەست لێ ی هەڵسان بە كۆكردنەوەی دەسهاتە گشتییەكان و خەرج كردنی هەر چۆن لە بودجەی پەسەندكرلودا هاتووە، لەبارەی دەسهاتەكانەوە هەموو دامەزراوەكانی حكومەت دەسهاتی خۆی كۆ دەكاتەوەو مافی دەوڵەت لە دەسهاتەكە دیاری دەكری وقۆناغی كۆتاییش بریتییە لە جێبەجێكردنی خەرجییە گشتییەكان كە بڕی پارەكە خەرج دەكرێت.

٤- قۆناغی چاودێری و پێداچوونەوە :

دوای ئـەوەی بودجـەی گشـتی ئامـادە دەکـرێ و پەسـەند دەکـرێ و دەست دەکرێ بەجێبەجێ کردنی دەچێتە قۆناغی چاودێری کردن لەسـەر جێبەجێکردنی بۆ ئەوەی لـە بـاش بەڕێوەچوونی دارایـی گشـتی و خراپـی و چاکیەکەی و خەملاندنی بووجە و چی لێ بەدەست هاتووە.

لایەنەکانی چاودێریکردنی دارایی زۆرن:

١- چاودێری پێشوەختە:

چـاودێری بـەر لـە خـەرجکردن واتـا ڕێگەنـەدان بـەهیچ جـۆرە خەرجیـەك، خەرجی تەنها دوای بەدەستهێنانی بڕیارێك لەلایەنی پەیوەندیدار لـە دەوڵـەت کە چاودێری خەرجییەکان دەکات.

٢-چاودێری دواتر یان سەردەمیانە(هاوچەرخانە):

ئەم چاودێریە دوای تەواوبوونی ساڵی دارایـی دەسـت پێدەکات ودوای دەرچوونی حسابی کۆتایی دەست پێ دەکات. کە چاودێریە لەسـەر خـەرجی و دەسهاتی گشتی ( باج و ڕەسم) تا دڵنیا بین لەوەی کە لایەنی بـەڕێوەبردن کارەکـانی بەباشـی بـەڕێوە بـردوە، هـەروەها ئـەوەی بەدەسـتهێناوە بـۆ خەزێنەی دەوڵەت بووە.

٣-چاودێری کارگێڕی (خۆیەتی):

ئەو چاودێریە کە دەسەڵاتی جێبەجێکردن لەسەر کارەکانی دەیکات، بۆیـە پێـی دەڵـێن چـاودێری (خۆیـەتی) کـە چـاودێری پێشـوەختە یـان پاشوەختەیە، لە خەرجکردن یان کۆکردنەوەی هەردووکیانە .

٤-چاودێری یاسادانان: (پەرلەمان)

ڕۆڵی دەزگاکانی یاسادانان تەنها پەسەندکردنی بودجەی گشتی نییە، بەڵکو چاودێری جێبەجێکردنیشی دەکات بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا بزانێ تا چەند دەسەڵاتی جێبەجێکردن پابەندبووە بەو بڕە پارەیەی کە لە بودجەدا دانراوە، خۆی لەراستیدا چاودێریکردنی کاری دەسەڵاتی یاسادانانەکە وەك چاودێرێك سەیری کارەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردن دەکات.

٥-چاودێری بێ لایەن:

زۆربەی وڵاتان هەڵدەستن بەدانانی سیستەمی چاودێری بۆ جێبەجێکردنی بودجە، ئەمەش ئەم دەزگایانە دەیکەن کە باری دەستووری تایبەتیان هەیە، ئەم دەزگایە سەربەخۆیەو سەر بەدەسەڵاتی حکومەت نییە، ئەم سەربەخۆییەش وادەکات کە چاودێریکردنەکەی باشترو گرنگتر بێ لە چاودێری کارگێڕی ویاسادانان، چونکە دەستەیەکی سەربەخۆن وهیچ جۆرە فشارێکیان لەسەر نییەو ناکەونە بەر کاریگەری کەسان و دەستەو لایەنی تر بۆ شاردنەوەو ونکردنی زانیارییەکان، بۆ نموونە: دادگای ژمێریاری لە فەرەنساو ئیتاڵیاویەلجیکاو دەزگای ناوەندی ژمێریاری میسرو چاودێری ژمێریاری گشتی لە ئینگلتەرا دیوانی چاودێری دارایی لە عێراق.

## پرسیارەکانی بەشی پێنجەم

١. پێناسەی ئەمانەی خوارەوە بکە:
زانستی دارایی گشتی، خەرجی گشتی، دەسهاتی گشتی، باج، دەفری باج
سەرچاوەی باج، نرخی باج، خۆلادان لە باج، رەسم، قەرزی گشتی
بودجەی گشتی، چاودێری کارگێڕی .

٢. دارایی دەوڵەتی پاسەوان چوو؟ زانایان چۆن بانگهێشتی ئەم قوتابخانەیان کردووە؟

٣. پەیوەندی زانستی دارایی گشتی لەگەڵ زانستەکانی دیکە چۆنە؟
(ئابووری، رامیاری، یاسا، ئامار)

٤. گرنگی زانستی دارایی گشتی لە ئابووری چییە؟

٥. گرنگترین ئەنجامەکانی کەڵەکەبووی دیاردەی دارایی وەکو دیاردەیەکی ئابووری چییە؟

٦. باسی جیاوازی نێوان دارایی گشتی و دارایی تایبەتی بکە؟

٧. ئەرکەکانی دارایی گشتی بەکورتی باس بکە.

٨. چۆن رامیاری دارایی کاریگەری هەیە لەسەر رێژەی پاشەکەوت؟

٩. باسی پێداویستیە گشتیەکان بکە .

١٠. بۆ حوکمدان لە سەر شمەکێك کە تایبەتە یان گشتییە چ جۆرە پێوەرێك بەکاردێت؟

١١. پێوەرەکانی دیارکردنی سروشتی پێداویستییە گشتییەکان ؟ لە گەڵ باسی هەر یەك لە پێوەرەکان .

١٢. مەرجەکانی خەرجی گشتی چین ؟

١٣. رێساکانی خەرجییە گشتییەکان بژمێرەو باسیان بکە .

١٤. باسی دابەشکردنی خەرجیە گشتیەکان بکە لەگەڵ کورتە باسێك بۆ هەر یەکەیان.

١٥. باسی هۆکارە راستەقینەکانی زیادبوونی خەرجی گشتی بکە .

١٦. باسی جۆرەکانی دەسهاتی گشتی بکە .

١٧. موڵکەکانی دەوڵەت دابەش دەبێت بۆ چەند بەش ؟

١٨. جۆرەکانی دەسهات لە موڵکەکانی دەوڵەت چییە ؟

١٩. مەبەستەکانی باج چییە ؟ باسی هەر یەکەیان بکە .

٢٠. ڕۆڵی باج چییە وەك ئامرازێکی دارایی .

٢١. جۆرەکانی باج بژمێرەو، باسی یەکێکیان بکە.

٢٢. قۆناغـەکان کـە نرخـی بـاج پێـدا تـێ دەپـەڕێ بـژمێرەو ؟ لەگـەڵ دیـارکردنی شێوەکانی .

٢٣. بۆ چی خۆ لادان لە باج یاسایی یە ؟ بە شێوەیەکی تر ئەم بنەمایانەی چین بۆ حوکمدانی خۆلادان لە باج ؟

٢٤. شێوەکانی ڕاکردن لە باج بژمێرە. چۆن دەتوانین ڕاکردن لە باج پێوانە بکەین ؟

٢٥. جۆرەکانی ڕەسم بژمێرە وباسی جۆرێك لە جۆرەکان بکە .

٢٦. کەی دەوڵەت پەنا بۆ قەرزی گشتی دەبات ؟

٢٧. چۆن دەوڵەت قەرز دەردەکات ؟

٢٨. جۆرەکانی قەرز بژمێرە ولەگەڵ باس کردنێکی کورت بۆ هەر یەکەیان .

٢٩. باسی ڕۆلی باج لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکان بکە .

٣٠. باسی کاریگەری ئابووری قەرزی گشتی بکە .

٣١. باسی رۆڵی قەرزی گشتی بکە لە وڵاتی تازە پێگەیشتووەکان .

٣٢. باسی کاریگەرە ئابووری پارەی تازە دەرکراو بکە .

٣٣. باسی ئەو بنەمایانە بکە کە بودجەی گشتی پشتی پێ دەبەستێ.

٣٤. ڕێساکانی بودجە گشتی بژمێرە وباسیان بکە .

٣٥. بۆ ڕێکخستنی بودجەی گشتی چەند قۆناغێك هەیە باسی قۆناغەکان بکە .

٣٦. باسی جۆرەکانی چاودێری بکە ، باسی هەریەکەیان بە کورتی بکە .

# سەرچاوەکانی بەشی پێنجەم


١. د. حامد عبدالمجيد دراز ، مبادئ المالية العامة ، مركز الاسكندرية للكتاب ، الاسكندرية ، ٢٠٠٠ .

٢. د. طاهر الجنابي ، دراسات في المالية العامة ، الجامعة المستنصرية ، مطابع التعليم العالي ، بغداد ، ١٩٩٠ .

٣. د. عادل فليح العلي ، المالية العامة والتشريع المالي والضريبي ، الطبعة الاولى ، دار الحامد للنشر والتوزيع ، عمان ، ٢٠٠٣ .

٤. د. عادل فليح العلي و طلال محمود كداوي ، اقتصاديات المالية العامة : المقدمة في المالية العامة والنفقات العامة ، الكتاب الاول ، جامعة الموصل ، دار الكتب للطباعة والنشر ، الموصل ، ١٩٨٨ .

٥. اقتصاديات المالية العامة : الايرادات العامة والموازنة العامة للدولة ، الكتاب الثاني ، جامعة الموصل ، دار الكتب للطباعة والنشر ، الموصل ، ١٩٨٩ .

٦. د. عبدالهادي النجار ، اقتصاديات النشاط الحكومي : المبادئ النظرية العامة وتطبيقات من دولة الكويت ، مطبوعات جامعة الكويت ، الكويت ، ١٩٨٢ .

٧. د. علي محمد خليل و د. سليمان احمد اللوزي، المالية العامة ، دار زهران، عمان ، ١٩٩٩ .

٨. محمد سلمان محمد برواري ، ضريبة العقار ودورها في تمويل الموازنة العامة في اقليم كوردستان العراق للمدة ١٩٩٣ – ٢٠٠٢ ، اطروحة دكتوراة غير منشورة ، جامعة صلاح الدين ، اربيل ، ٢٠٠٤ .

٩. د. محمود حسين الوادي و د. زكريا احمد عزام ، مبادئ المالية العامة ، الطبعة الاولى ، دار المسيرة ، عمان ، ٢٠٠٧ ،

١٠. هشام محمد صفوت العمري ، اقتصاديات المالية العامة والسياسة المالية ، الجزء الاول ، الطبعة الثانية ، جامعة بغداد ، مطبعة التعليم العالي ، بغداد ، ١٩٨٨ .

١١. هشام محمد صفوت العمري ، اقتصاديات المالية العامة والسياسة المالية ، الجزء الثاني، الطبعة الثانية ، جامعة بغداد ، مطبعة التعليم العالي ، بغداد ، ١٩٨٨ .

١٢. Edito Creps ، التامين و التخطيط و التنظيم ، موسوعة عالم التجارة ، بيروت، ١٩٩٩.

# بەشی شەشەم
## رێکخراوە ئابوورییە نێو دەوڵەتییەکان
INTER NATIONAL ECONOMIC ORGANNIZATIONS

رێکخرلوی ئابووری بریتییە لە گەلەکۆمەیەکی ئابووری چەند لایەنیە و چوارچێوەیەکی کاری هاوبەشە کە لەسەر بنەمای هاوکاری ئابووری نێودەوڵەتی دامەزراوە بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییە سەرەکییەکان بۆ بەدیهێنانی کەڵك و سوودی ئابووری هاوبەش بۆ لایەنەکانی گەلەکۆمەکیەکە.

دوو جۆر رێکخرلوی ئابووریی هەن و ئێستا لەناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان دا لەکاردان و ئەمانەن:

١- رێکخراوە ئابوورییە نێودەوڵەتییەکان:

٢- رێکخراوە ئابوورییە هەرێمییەکان (ئیقلیمییەکان):

رێکخراوە ئابورییە نێودەوڵەتییەکان: (بریتییە لەو گەلەکۆمەیە ئابوورییەی کۆپەستنی ژمارەیەك دەوڵەت کە تێیدا ئەندامن و کە رێباز و سیستەمی ئابووریان و ئاستی پەرەسەندنی ئابووریشیان جیاوازە و هەموجۆرەو ولآتانی ئەندام هەندێ بنەماو بەڵگەنامە یان لەنێوانیاندا هەیە و پێویستە هەموو لایەنە بەشداربووەکە کاری پێبکەن و لێی لانەدەن بە مەبەستی هاریکاری و هاوکۆمەکی بۆ بەدیهێنانی ئامانج و کەڵك و سوودی هاوبەش، هەر رێکخراوێکیش لەو رێکخراوانە پسپۆڕ و لێزانە لە چارەسەرکردنی گرفتێك لە گرفتە ئابوورییەکانی نێوان دەوڵەتان) لە خوارەوەش هەندێ لەو رێکخراوە ئابوورییە نێودەوڵەتیانە کە ئەمرۆ لە کاردان دەخەینەروو.

**یەکەم - سندوقی دراوی نێودەوڵەتی:**

**ئەم سندوقەدوای کۆبوونـەوەی سـاڵی ١٩٤٤ لـە ناوچـەی برتـۆن وودز لـە ئەمەریکا بە رەزامەندی ٣٠ وڵات دامـەزرا ولـە سـاڵی١٩٤٧ دەسـتی بـەکارەکانی کرد** وئامانجی سەرەکی لە دامەزراندنی بریتین لە :

**أ- بەدەسـت هێنـانی سـەقامگیری نرخـی دراوەکـان لـە بازاڕەکـانی دراوگۆڕینەوەی بیانی.**

**ب- یارمەتیدانی وڵاتە ئەندامـەکان بـۆ چارەسـەرکردنی لاسـەنگی تـەرازووی پارەدانیان. بۆ بەدیهێنانی ئـەم ئامانجانـە چـەندین رێوشـوێن لەلایـەن سندوقەکە وەرگیراوە لەمانەش:**

**١ - دیاریکردنی نرخی دراوگۆڕینەوە بۆ دراوی وڵاتە ئەندامەکان لە بەرامبەر زێر یاخود دۆلار وسـندوق رێگـە بـە وڵاتـە ئەندامـەکانی دەدا نرخـی پـارەی خۆیـان هاوسـەنگ بکـەن بەمـەرجێ لـە ١٪ی نرخـی بنچـینەیی زیـاتر نـەبێ، بـە بـێ دەسـتتێوەردانی سـندوق، بـەلام گـەر لـەم رێژەیـە زیـاتر بـوو پێویسـتی بـە رەزامەندی سندوق دەبێ.**

**٢- بڕیاردان لەسەر بنەمای ئازادی لە گۆڕینەوەی دراوی بێگانە لە ناو دەوڵەتـە ئەندامەکان وپێویستە دەوڵەت هیچ جۆرە بەربەستێك لەسەر ئەم کاروچالاکیانە دانەنێ:**

- **چاودێریکردنی دراوی بیانی.**
- **سیستەمی چەندجارەیی نرخی دراو گۆڕینەوە.**
- **رێکەوتنی پێدانی دوولایەنی.**

**٣- هەڵسان بە راوێژکردنی ساڵانە لەگەڵ دەوڵەتە ئەندامەکان بۆ ئەوەی بزانـرێ ئـەو رامیاریـە ئابووریيـەی پـەیرەوی دەکـات لەگـەڵ ئامانجـە بنەرەتـەکانی سندوقەکە دەگونجێ.**

٤- پێشکەشکردنی ئاسانکاری دارایی لە دەرامەتەکانی سندوقەکە بۆ چارەسەرکردنی لەناکاوی لاسەنگی تەرازووی پارەدان بەمەرجێك هۆکارەکانی دروستبوونی لە دەرەوەی ویستی دەوڵەت بووبن.

٥- سندوق راوێژکاری هونەری پێشکەش بە دەوڵەتە ئەندامەکان دەکات.

## رێکخستنی سندوقی دراوی نێو دەوڵەتی:

سندوق هەڵدەستێ بەرێکخستنی ئەوەی پێی دەگوترێ (پشك یان بەش) پشك ئەو برە دەرامەتە داراییە کە دەوڵەتە ئەندامەکان بۆ بەشداربوون لە سندوقە دادەنرێت، و کۆی ئەو پشکانەی دەوڵەتە ئەندامەکە بەشداری پێ دەکات ئەوا چەند شتێکی بۆ دیاری دەکات:

١- مافی دەنگدانی دەبێت لەسەر ئەو بریارانەی کە لەلایەن سندوقەوە دەردەچێت.

٢- سروشت و قەبارەی ئەو ئاسانکارییە داراییانەی کە دەتوانێ بە دەستی بێنێ .

٣- پشکی(بەشی) هەر ولاتێك لەسەر چەند پێوەرێ دیاری دەکرێ، گرنگترینیان:

أ- سەرجەمی داهاتی نەتەوەیی .

ب- یەدەگی درلو لەو پارانەی کە پێشەوایەتیان هەیە.

ج- قەبارەی هاوردەکان.

د- بارگۆران لە تێکرای ناردەنی.

ه- رێژەی ناردەنی لە داهاتی نەتەوەییدا.

ئەو ڕێسایەی کە بەر لە ساڵی ١٩٧١ هەبوو دەبوایە هەر دەوڵەتێك ٢٥٪ لەبەشەکەی بەشێوەی زێڕو ٧٥٪یش بەپارەی نیشتمانی وڵاتەکەی بدات، بەڵام گەر وڵاتێك ئەو بڕە زێڕەی نەبوایە بۆ دانی بەشەکەی ئەوا سندوق تەنها ١٠٪ی بە زێڕ یان دۆلار لێ وەردەگرت، ئەوەی دەمایەوە بەپارەی نیشتمانی بوو، ئەو بڕە پارەیەی وڵاتە ئەندامەکان یان لە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی دادەنرا یان لەم چوار بانکە کە دیاریکرابوو ئەوانیش:

- بانکی یەدەگی فیدراڵی لە نیویورك.
- بانکی ئینگلترا.
- بانکی فەڕەنسا.
- بانکی یەدەگی فیدراڵی لەهیندستان.

لە ساڵی ١٩٧٥ بەشداریکردن بەزێڕ لەبەشی دەوڵەتان لابران و بوو بە دراوی نیشتمانی، دەوڵەتان قەباڵەی هەڵگیراویان لە سندوق دادەنا کە بۆ ئاڵوگۆڕکردن بەکار دەهات وسندوق لەبەر هەر هۆکارێك پێویستی بەو دراوانە بوایە ئەوا بەهای بۆ دادەنا.
مافی سندوقەکەیە کە هەر پێنج ساڵ جارێك گەر پێویست بوو پێداچوونەوە بە بەهای پشکی ئەندامەکانی بکات وهەمواریان بکات و بەشێوەیەکی گشتی سەرجەم پشکەکان دوای هەمواركردنی هەشتەمین لەکۆتایی هەشتایەکانی سەدەی بیستەم گەیشتە نزیکەی (٩٠) ملیار یەکە لەمافی راکێشانی تایبەتی (SDR)، بەپێی گرنگی وڵاتەکان دابەشکرا.

لەبەرئەوە سندوق بۆتە دەسەڵاتێکی ئابووری کە بایەخێکی گەورەی لە ئابووری جیهانیدا هەیە و لەکاتی ئێستادا سەرپەرشتی جێبەجێکردنی بەرنامەی راستکردنەوەی ئابووری دەکات کە لە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو پەیڕەو دەکرێ .

بەڕێوەبردنی سندوق:

سندوق لەرێگەی کۆمەڵی دەزگاوە بەڕێوە دەبرێت کە لەمانە پێك دێت:

١- ئەنجوومەنی پارێزگاران.

٢- ئەنجوومەنی کارگێڕی سندوق.

٣- بەڕێوەبەری گشتی.

دووەم- بانکی نێودەوڵەتی:

بە دووەم دەزگای نێو دەوڵەتی دادەنرێ کە بەگوێرەی ڕێکەوتنامەی بریتۆن وودز دامەزراوە، بەشێوەیەکی فەرمی لە ساڵی١٩٤٦ دەستی بەکارەکانی خۆی کرد. ئامانجی سەرەکی لە دامەزراندنی ئەم بانکە بریتییە لە:

١- دووبارە ئاوەدانکردنەوەی ئەو ناوچانەی کە شەڕی دووەمی جیهانی کاول و وێرانی کردوون.

٢-پێشکەشکردنی قەرز بە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو.

بانکی نێو دەوڵەتی قەرزی درێژخایەن دەدات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی و زۆرینەی ئەو دەوڵەتانەی سوودیان لە بانکی نێو دەوڵەتی وەرگرتووە وڵاتانی ئەورووپیی ڕۆژئاوان، کە بەگوێرەی (پرۆژەی مارشاڵ[1]) دووبارە بونیاد نراوەتەوە، بانکی نێودەوڵەتی تەنیا قەرز بە دەوڵەتە ئەندامەکانی دەدات، دەتوانێ قەرز بە کۆمپانیاو دەزگا تایبەتیەکانیش بدات ئەویش بەگرێنتی وەرگرتن لە حکومەتی ئەو وڵاتانە کە چاودێری ئەم کۆمپانیاو دەزگایانە دەکەن.

کرد و پێویستە لەسەر ئەو دەوڵەتانەی دوای قەرز لە بانکی نێودەوڵەتی دەکەن، ئەندام بێت لە سندوقی دراوی نێو دەوڵەتی سەرباری ئەندامیەتی لە بانکدا و ئەگەر دەوڵەتێك لە سندوقەکە پاشەکشە بکات ئەوا لەئەنجامدا ئەندامیەتی لە بانکی نێودەوڵەتی لەدەست دەدات .

---

(١)ئەو پرۆژەیە بوو کە(جۆرج مارشاڵ) وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دوای شەڕی دووەمی جیهان رایگەیاند ئەویش بە پێدانی قەرز و یارمەتی و کۆمەك بۆ وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی وێرانکارییەکانی شەڕی دووەمی جیهان.

## کارگێڕی بانك:

### ١- ئەنجوومەنی پارێزگاران:

بانك لەلایەن ئەنجوومەنی پارێزگارانەوە بەڕێوەبردرێت کە هەر دەوڵەتێکی ئەندام پارێزگارێك بۆ خۆی دیاری دەکات بۆ نوێنەرایەتی ئەندامیەکەی و ئەنجوومەن ساڵی جارێك کۆدەبێتەوە.

### ٢ - ئەنجومەنی کارگێڕی بانك:

ئەنجوومەنێکی کارگێری بانك هەیە کە لە (٢٠)بەڕێوەبەری جێبەجێکار پێکهاتووە، پێنج لەوانە نوێنەری ئەو دەوڵەتانەن کە زۆرترین پشکیان هەیە وەکو ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بەریتانیا ، ئەڵمانیا، فەرەنساو هیندستان، کەچی ئەندامەکانی تر لەلایەن ئەنجوومەنی پارێزگارییەوە هەڵدەبژێردرێن و زۆر جار لەسەر بنەمای جوگرافییە،بەڵام سەرۆکی بانك لەلایەن ئەنجوومەنی پارێزگارلنەوە دیاری دەکرێت .

## دەرامەتە داراییەکانی بانك:

### ١- سەرمایەی بانك:

لەکاتی دامەزراندنی بانك بە گوێرەیی رێکەوتنەکەی بریتۆن وودز سەرمایەکەی بە ١٠$ ملیار دۆلار دانرا، بەسەر پشکەکان دابەشکرا کە بەهای هەریەکێك لە (١٠٠٠٠٠)$ سەد هەزار دۆلار بوو لەلایەن دەوڵەتە ئەندامەکان بەقەرزوەر دەگیرا، بەڵام سەرمایەی بانکەکە لە ئەنجامی زیادبوونی ژمارەی بەشداربووانی زیادی کردوو گەیشتە (٣٠$) سی ملیار دۆلار بەشداران بەم شێوەیەی خوارەوە بەشەکەیان دەدەن:

٢٪ بەشی دەوڵەتە ئەندامەکە بە زێڕ یان دۆلاری ئەمەریکی دەدرێت.

١٨٪ بەشەکە بە دراوی دەوڵەتە ئەندامەکە دەدرێت.

٨٠٪ دەوڵەتە ئەندامەکە هەڵی دەگرێت بۆ ئەو کاتەی بانکەکە پێویستی پێ دەبێت.

٢- قەرزکردن:

بانك لە رێگای دەرکردنی قەباڵەو فرۆشتنی لە بازاڕی وڵاتە ئەندامە دەوڵەمەندەکان بەتایبەتی ولایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنساو یابان ..هتد قەرز دەکات.

٣- یەدەگ و قازانج (سوو):

برێکی زۆر لە قازانج و سوو لەلای بانك کەڵەکە دەبێت، ئەویش لە ئەنجامی ئەو قەرزانەی کە دەیدات بە ئەندامەکان.

**شێوازەکانی قەرزدانی بانك:**

بانك بە شێوازو رێگای جیاواز قەرز وکۆمەك دەداتە وڵاتە ئەندامەکانی، بەڵام نابێ قەبارەی ئەو قەرزەی دەیدات لە سەرمایەی وڵاتەکە زیاتر بێت:

١-پێشکەشکردنی قەرز بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەسەرمایەی بانك و قازانج و یەدەگەکانی.

٢-قەرزدان لەو دەرامەتەی کە بانك راستەوخۆ لە رێگەی قازانجی ئەو قەرزانەی خۆی دەیدات، لە رێگای دەرکردنی قەباڵە لە بازاڕەکانی دارایی وڵاتە ئەندامەکان.

٣-بانك هەڵدەستێ بە دەستەبەرکردنی(ضمان) ئەو قەرزانەی بانکەکان ودەزگا و تاکەکان پێشکەشی وڵاتە ئەندامەکانی دەکەن کە پێویستییەکی زۆریان بەم قەرزانە هەیە.

**بانكی نێو دەوڵەتی وڵاتە دواكەوتووەكان:**

وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا زۆرترین ئەو وڵاتانەن سوودیان لە قەرزی بانك و كۆمەك و ئاسانكارییەكانی وەرگرتووە، چونكە ئەم وڵاتانە بەر وێرانكاری جەنگی دووەمی جیهان كەوتن، بۆیە بانكی نێودەوڵەتی پاڵپشتی لە (پرۆژەی مارشاڵ) كرد لە پێناو دووبارە ئاوەدانكردنەوەی ئەوروپا لە ماوەیەكی دیاری كراوی كورتدا بە مەرجی سادە وقازانجی كەم.

هەرچەندە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو بە پلەی دووەم دێن لە سوود وەرگرتن لەم بانكە، بەڵام بانك قەرز ویارمەتی وڕاوێژكاری پێشكەش كردوون تاوەكو گەشە بە ئابوورییەكانیان بدەن، وهەروەها نەتەوە یەككگرتووەكانیش پشتگیرییان لەو وڵاتە تازە پێگەیشتووەكان كردووە بۆ قەرز پێدان و گەشەپێدانی ئابووریان.

قەرزدانی بانكی نێودەوڵەتی بە وڵاتانی تازە پێگەیشتوو، زیاتر جەختی لە سەر پارەداركردنی بواری وەبەرهێنانی پرۆژەكانی ژێرخان وخزمەتگوزارییە گشتییەكان دەكرد.

دوای دامەزراندنی ژمارەیەك دەزگای گەشەپێدانی سەریەبانك، چالاكی بانكەكە فراوانتر بوو لەوانەش: (دەزگای پەرەپێدانی نیودەوڵەتی)، كە قەرزی درێژخایەن دەداتە وڵاتە ئەندامەكان ودەزگای پارەداركردنی نێودەوڵەتی.

سێیەم - ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی:

بیرۆکـەی دامەزرانـدنی ڕێکخـراوی بازرگـانی جیهـانی بـۆ سـاڵی ١٩٤٧ دەگەڕێتەوە کاتێك نوێنەری ٥٢ وڵات لـە هاڤانـا کۆنگرەیـەکی نێودەوڵـەتیان بەست بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی بارودۆخی بازرگانی نێودەوڵەتی وکارەکانی لەو کۆنگرەیەدا ئیمزا لەسەر دامەزراندنی ڕێکخراوێکی بازرگـانی جیهـانی کـرا وئـەو ڕێکەوتنـە بـە (**ڕێکـەوتنی هاڤانـا**) ناسـرا، لـە بـەر ئـەوەی کۆنگرێسـی ئـەمریکی ئیمـزای لەسـەر ڕێکـەوتنی سـەرەوە نـەکردبوو جێبـەجێ نـەکرا ونەکەوتە کار .

وە هەر لەو ساڵەدا دانوسان لە نێوان ٢٣دەوڵەت لـە شـاری جنێـف لـە سویسرا دەکرا دەربـارەی پێکهاتـەی گـومرکی وڕێکـەوتن لەسـەر مـۆرکردنی ڕێکەوتنێك لە بـارەی پێکهێنـانی ڕێکخراوێـك لـە ژێرنـاوی (**پێکهاتـەی گشـتی رەسمی گومرك و بازرگانی - گات**) لەو کاتەوەی (گات) دامـەزراوە، لەلایـەن وڵاتەبەشـدارەکانی ئـەم پێکهاتەیـە بـە شـێوەیەکی نارێـك کـۆنگرەی خۆیـان دەبەستن لە شێوەی چالاکی یەك بەدوای یەکدا کە (٨) کۆنگرەیان بەسـتووە وگرنگترینیـان کـۆنگرەی هەشـتەم بـوو کـە لـە ئۆروگـوای لـە ئـەیلولی ١٩٨٦بەسترلو بە هۆی بوونی جیاوازی لە نێـوان کۆمەڵـەی ئـابووری ئـەوروپا وولایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا هـەر بـەردەوام بـوو تـاوەکو ئـەم جیاوازیانەی نێوانیـان چارەسـەرکرا، ئەمـەش ڕێگـەی خۆشـکرد بـۆ بەسـتنی کۆنگرەی مەراکش لە نیسانی ساڵی ١٩٩٤ کـە تێیـدا بـە شـێوەیەکی فـەرمی کۆتایی بە خولی ئۆروگوای هێنرا بە ئامەدەبوونی ١١٨ لەنوێنەری دەوڵەتان.

ئەوەی لـەو کۆنگرەیـە ڕوویـدا زۆر گـرنگ بـوو، چـونکە بـریتی بـوو لـە ڕێکـەوتنی ٩٧ وڵات لـە سـەر دامەزرانـدنی ڕێکخراوێکـی بازرگـانی جیهـانی،

وبڕیاردرا ئەم ڕێکخراوە جێگەی پێکهاتەی گات بگرێتەوە کە لە ساڵی ١٩٤٧ ڕێکەوتنی لە سەر کرابوو.

بۆ دیارکردنی پەیکەری یاسایی و زانینی ڕۆڵ وگرنگی ئەم ڕێکخراوە لە ئابووری جیهاندا، بەو شێوەیەی خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

## ئەرکەکانی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی:

ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بە چوارچێوەیەکی بنەڕەتی هاویەش بۆ گفتوگۆی بازرگانی لە نێوان وڵاتە ئەندامەکان دادەنرێ، بە تایبەت لە بارەی ئەو ڕێکەوتننامە و بەڵگەنامە یاساییانەی کە سەرپەرشتی دەکا وپەیوەستە بە بازرگانی شمەك و خزمەتگوزاری و ڕێوشوینی وەبەرهێنان ولایەنی یاسایی بۆ خاوەنداریەتی هزری وزۆر شتی تر.

هەموو وڵاتانی ئەندام لەم ڕێکخراوە کۆمەڵێك ماف وەك یەکیان هەیە بە چاو پۆشین لە قەبارەی دەوڵەتەکە و توانا ئابوورییەکانی، یاخود بەشداریکردنی لە بازرگانی کردنی نێودەوڵەتیدا.

هەروەها لە چوارچێوەی ئەم ڕێکخراوە لە سەر وڵاتە ئەندامەکان کۆمەڵی پابەندی دانراوە، ئەم پابەندییەش بە پێی جیاوازی ئاستەکانی گەشەکردن لەم وڵاتانە، جیاوازییان هەیە، ڕێکەوتنامەی دامەزراندنی ڕێکخراوەکە کۆمەڵێ ئەرکی بۆ ڕێکخراوەکە دیاریکردووە،کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- سەرپەرشتیکردنی جێبەجێکردن و بەڕێوەبردنی کارەکانی ڕێکەوتنە بازرگانیەکانی چەند لایەنی لەنێوان وڵاتە ئەندامەکاندا، سەرەڕای ئەو ڕێککەوتنە کۆمەڵەکیانەی کە لەخولی تۆکیۆدا پەیدابوون کە تەنها ئەو

لایەنانـەی پەسـەندیان کردبـوو و پابەنـدبوون پێیـەوە بـەبێ ئەندامـەکانی دیکە، بە پێچەوانەی سروشتی ئەو ڕێککەوتنانەی کە لە (تۆرگوای) هـەبوو دەبوایە هەموو ئەندامان پێیەوە پابەند بن.

٢- سەرپەرشتیکردن لەسەر لابردن وچارەسـەرکردنی کێشـەو ناکۆکیـەکانی نێـوان وڵاتـان، لەڕێگـەی دەزگـای چارەسـەری ناکۆکییـەکان، چـۆنیەتی جێبـەجێکردنی دەقـی ڕێککەوتنـە بازرگانیـەکان، چارەسـەرکردنی ئـەم ناکۆکیانـە بـەگوێرەی ئـەو سـەرەتاو بنەمایانـەی کـە لـە ڕێککەوتنەکـەدا هاتووە، لەم بارەیەوە.

٣- بـەڕێوەبردنی دەزگـای پێداچـوونەوەی رامیارییـەکانی بازرگـانی وڵاتـانی ئەنـدام، بـەگوێرەی ئـەو ماوەیـەی کـە دیـاریکراوە دوو سـاڵ بـۆ وڵاتـانی پێشـکەوتوو وچـوار سـاڵیش بـۆ وڵاتـانی تـازە پێگەیشـتوو. ئەمـەش بەمەبەستی زانینی ئەو گۆڕانکاریانەی کەبەسەر ئەم رامیاریانەدا دێت و تا چەند لەگەڵ بنەماکانی پێکهاتەی (گات) گونجاوە، ڕێگەی بەهەموو وڵاتـە ئەندامەکان دلوە لێکۆڵینەوەیەکی روون و ئاشکرا بکات.

٤- هاوکـاری کـردن لـە نێـوان سـندوقی دراوی نێـو دەوڵـەتی و بـانکی نێودەوڵـەتی و ئـەو ئاژانسـانەی سـەر بـەوانن پەیوەسـتن بـە لایەنـەکانی دارایـی و دراو و بازرگـانی ئـابووری جیهـانی بـە ئامـانجی بەدەسـتهێنانی زۆرترین هاوتەگبیری لە دانانی سیاسەتی ئابووری جیهانیدا.

جێگـای ئامـاژە پێدانـە کـە ڕێکخـراو خـاوەنی کەسـایەتی بـاوەڕپێکراو و پێکهاتەی یاسایی پلەی تایبەتی و حەسانەی (ماف پارێزراو) کە دەتوانـێ ڕاستەوخۆ کارەکـانی بـەڕێوە ببـات، هـەروەها نوێنـەرەکانی لـە ئەنـدام و کارمەندانی سەر بە ڕێکخراوەکە خاوەنی مافی تایبەتی و پارێزراوی خۆیـان

هەیـە، ئەمــەش وایکـردووە بەســەربەخۆیی ئەرکـەکانیان لــە ڕێکخـراودا ڕاپەڕێنن و بەشێوەیەك کە مافەکانیان هیچ کەمتر نییە کە بـە کارمەنـدانی دەزگا تایبەتیەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەخشراوە.

پەیکەری ڕێکخستنی ڕێکخراوەکە:

پەیکەری ڕێکخستنی ڕێکخرلوەکە کە لە ماددەی چواری ڕێکەوتنەکـە دیاریکراوەك پێك دێت لە :

١ – کۆنگرەی وەزارەت.

٢ – ئەنجومەنی گشتی.

٣ – ئەنجومەنە پسپۆرەکان.

٤ – لیژنە لقییەکان.

٥– کۆنگرەی وەزاری هەڵدەستی بەدانانی ئەم لیژنانەی خوارەوە:

أ– لیژنەی بازرگانی و گەشەپێدان.

ب– لیژنەی تەرازووی پارەدان.

ج– لیژنەی بوجەو کارگێڕی.

د – سکرتاریەت.

ڕۆڵی کاریگەری ڕێکخراوەکە لە ئابووری جیهانیدا:

بەپێی دەقی ڕێککەوتننامەی دامەزراندنی ڕێکخرلوی بازرگانی جیهـانی کە تێیدا هاتووە:

((وەك هــەوڵێك بـۆ نزیـك کردنـەوە لـەکرداری دارشـتنی رامیاریـەکانی ئابووری نێودەوڵەتی ڕێکخرلوەکە هەڵدەستێ بە هاوکاریکردن لەگەڵ هەریـەك

لــه ســندوقی درلوی نێودەوڵــەتی و بــانکی نێودەوڵــەتی بــۆ بونیادنــان و ئاوەدانکردنەوە بۆ تەواوکردنی بنەماکانی بەڕێوەبردنی ئابووری جیهان)).

بۆ ئەوەی رۆڵی داهاتووی ئەم رێکخراوەمان لـە بـەڕێوەبردنی ئـابووری جیهان لەرووی بازرگانیەوە بۆ روون بێتەوە، ئەمانە دەخەینەڕوو:

أ- قەبارەی بەشداریکردنی وڵاتان لە ئەندامێتی رێکخراوەکەی:

زیاتر لە (١٠٠) دەوڵەت ئیمزایان لەسەر بەڵگەنامەی کۆتایی کـۆنگرەی مەراکش کردووەو، وا مەزەندە دەکرێت ژمـارەی ئەندامـەکانی بـەر لـەکۆتایی دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەك بگاتە سەدو چل ئەنـدام، کـە بەشـێکی گەورە لـە ئەندامـەکانی سـەر بـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان پێك دەهێنن، کـە بەشی خۆی لە ٩٠٪ قەبارەی بازرگانی دەنوێنێ، ئەوە مانای ئەوەیە کە هـەر رامیاریـەکی رێکخراوەکـە بڕیـاری لەسـەر دەدات ئـەوا بەشـێوەیەکی کـرداری گوزارشـت لـە نـاوەرۆکی سیسـتەمی بازرگـانی جیهـانی دەکـات، ئەمـەش وا دەکات کـە جـۆرە دابڕانێـك بەسـەر ئـەو وڵاتانـە بچەسـپێ کـە ئەنـدامی ئـەم رێکخراوە نین.

ب-کەمکردنەوەی لایەنی (سەروەری رەها) (السـیادە المطلقـە) لـە دەوڵەتـە ئەندامەکان:

کارەکـانی رێکخـراو تـەنها لایـەنی بازرگـانی شمـەك ناگرێتـەوە، بـەڵکو بازرگــانی خزمــەتگوزاری و مافــەکانی خاوەنداریــەتی هــزری و رێوشــوێنی وەبەرهێنان و پەیوەندی لە نێوان بازرگانی و ژینگەش دەگرێتـەوەو تەنانـەت چالاکیەکانی فراوانتریش دەبـێ بـۆ ئـەوەی رامیاریـەکانی بازرگـانی وڵاتـان و سیستەمی گومرکی وڕێووشوێنی هـاوردەنی و پاڵپشـتکردنی نـاردەنی لـەخۆ بگرێت وپێویستە یاسـا و رێسـاکانی دەوڵەتـە ئەندامـەکان هـەموار بکـرێ تـا

لەگەڵ رامیارییەکانی رێکخراوەکە بگونجێ و هەموو ئەمانە دەبنە هۆیەك بۆ کەمکردنەوەی لایەنی سەروەری رەهای دەوڵەتە ئەندامەکان لە رامیاریەکانی بازرگانی وەك پابەندیەك بۆ بەرژەوەندییەکانی رێکخراوەکە.

ج –سیستەمی کارکردن لە رێکخراوەکە:

سیستەمی کارکردن لە رێکخراوەکە مافی ئەوەی هەیە پێداچوونەوەی رامیاری بازرگانی دەوڵەتە ئەندامەکان و چاودێری پابەند بوونیان بە رێسا و پرەنسیپەکانی پێکهاتەی گات بکات، ئەمەش رێگە خۆش دەکات بۆ ئەوەی رێکخراوەکە رامیاری بازرگانی وڵاتە ئەندامەکان هەڵبسەنگێنێ بۆ ئەوەی ئەوەی بزانێ تا چەند لەگەڵ ئەم رێساو پرەنسیپانە گونجاون و دەرفەتدان بەهەر ئەندامێك بۆ ئەوەی راوێژ لەگەڵ یەکتری بکەن بۆ بەدیهێنانی نزیك بوونەوە لە رامیارییەکانیان و دابینکردنی بەرژەوەندی هەردوولا بەکارکردن بە بنەمای شەفافیەت (روونی و ئاشکرایی).

د– دەسەڵاتەکانی دەزگای چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان:

دەزگای چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان لە رێکخرلوی بازرگانی جیهانی توانای پێشبینیکردنی هەیە بۆ ئاراستەکردنی سیستەمی بازرگانی جیهانی نوێ، هەروەها کاردەکات پاراستنی مافی دەوڵەتە ئەندامەکان و پاراستنی ئەو پابەندیەی کە بریاری لەسەر دراوە بەگوێرەی رێکەوتنەکانی کە رێکخراو هەیەتی و شایانی باسکردنە حوکمەکانی ئەم دەزگایە بەسەر هەموو لایەنە ناکۆکەکان دادەنرێ و لە دەزگاکەشە چاودێری جێبەجێ کردنی ئەم حوکمانە بکات.

## چوارەم-ڕێکخراوی وڵاتانی ناردەنی نەوت(ئۆپێك)
## OPEC

ORGANIZATION OF PETROLEUM EXPORTERS CONTRIES

ڕێکخراوی وڵاتانی ناردەنی نـەوت کـە بـە ئۆپێـك (opec)ناسـراوە لـە ساڵی ١٩٦٠ لـە بەغـدا دامـەزرا و لەلایـەن ( ئێـران و عێـراق و کوێـت و وڵاتـی عەرەبی سعودی وڤەنزویلا دواتر چەند وڵاتێکی دیکە هاتنە ناو ئەو ڕێکخـراوە وەك:(جـەزائیر ولیبیـا وئیمـاراتی یـەکگرتووی عـەرەب و نایجیریـا و قەتـەر و ئەندەنووسیا و ئیکوادۆر و گابوون) وبارەگای ڕێکخراوەکە ئێستا لە ڤێنایە لە (نەمسا).

وڵاتـانی ئۆپێـك لـەزۆر بـواردا لەیـەك ناچـن و جیاوازیـان لـە ئاسـتی گەشەکردنی ئابووریدا هەیە، هەروەها لە بارەی سروشتی سیستـەمی ئابووری و ڕامیـاری و کۆمەلایەتییـەوەش جیـاوازن، کەچـی تـا ڕادەیـەك توانیویـەتی کاریگەری لە سەر بازاڕی نەوتی نێو دەوڵەتی هەبێ، ئەمەش لە میانـەی ئـەو هاوکـاری و هاریکاریکردنـەی کـە لـە نێوانیانـدا هەیـە لـەبوارەکانی، دەسـت بەسەر بەرهەمهێنان و وەبازارخستن و نرخدانانی و دیـاریکردنی سیاسـەتێکی گونجاو بۆ بەرهەمهێنان ونرخدانان.

ئامانجەکانی ڕێکخراوی ئۆپێك:

گرنگترین ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە کە دەوڵەتە ئەندامەکان دەیانەوێ بەدی بێنن بریتین لە:

١- هەماهەنگی لە ڕامیاری نەوتدا بەتایبەتی ڕامیاری بەرهەمهێنان وڕامیاری نرخدانان وپەنا بردنە بەر باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان.

٢- هەوڵدان بۆ دانانی نرخێکی گونجاو و دادپەروەرانە بۆ دەرامەتە هایدرۆکاربونییەکان.

٣- پەنابردنەبەر باشترین ڕێگا بۆ دەستەبەرکردنی نرخێکی جێگیر لە بازاڕی جیهانیدا.

٤- دڵنیابوون لە چوونی نەوت بۆ وڵاتە بەکاربەرەکان بەو نرخەی کە لە سەری ڕێکەوتوون و لە بازاڕی جیهانی باوە، وبۆ بە دەستهێنانی دەرامەتی تەولو بۆ پارەدارکردنی پێدلویستییەکانی پەرەپێدان، وەبەرهێنان لە کەرتی نەوت، بۆ مسۆگەرکردنی بەرهەمهێنان و بەدەستهێنانی دەسهات.

٥-بەیەکەوە بەستنی وەبەرهێنان لە کەرتی نەوت و بازرگانیکردن بە نەوت کرداری پەرەپێدانی ئابووریەوە.

هاوسەنگی لە بازاڕی نەوت کارێکی ئاسان نییە، ئەمەش بەهۆی بەرزبونەوەو نزمبونەوە لە نرخی نەوت کە بەزۆری نرخی بەرز دەبێتەوە، ئەمەش یەکێکە لە هۆکارەکان کە بەرژەوەندییەکانی ئەندامانی ناگەنە یەك لە ئۆپێك و زۆریەی جار گرانە هەموویان لە سەر رامیاری ڕێکخراوەکە ڕێکبکەون، وناکۆکیەکان بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە :

١- پێویستی ئەو دەوڵەتانەی یەدەگیان کەمە (تا ڕادەیەك کەمە) و ژمارەی دانیشتوانیان زۆرە، وەهەروەها پێویستی هەندێ دەوڵەت بونیادنانەوەی ئەوانەی لە ئەنجامی جەنگی زۆرەرە تووشی هاتوون، بۆیە کە ئەم جۆرە دەوڵەتانە پێویستیان بە دەسهاتی زۆرە، ئەمەش وادەکات هەوڵی بەرزکردنەوەی نرخ بدەی، بەڵام دەوڵەتەکانی تری ئەندام لە ئۆپیك کە خاوەنی یەدەگی گەورەن لە نەوت و ژمارەی دانیشتوانیشیان کەمە ئەم دەوڵەتانە لەوە دەترسن نرخ بەرز بێتەوە، بۆ ئەوەی کار نەکاتە سەر دەسهاتیان لە ئایندەدا لە ئەنجامی گەیشتن بە جێگرەوەی نەوت .

٢- پابەندنەبوونی دەوڵەتە ئەندامەکان بەو بەشە بەرهەمهێنانەی کەلەسەری ڕێکەوتوون.

٢- ڕێکخراوە ئابوورییە هەرێمییەکان (ئیقلیمییەکان):

جۆرە ڕێکخراوێکی ئابوری نێودەوڵەتییە لەسەر بنەڕەتی (هەرێمی) لەنێوان ژمارەیەك دەوڵەت دا دامەزراوەو پەیوەندی مێژوویی، یان رامیاری یان کۆمەلایەتی و دراوسێیەتی لە نێوانیاندا بەهێزەو، واتا ئەم جۆرە ڕێکخراوە لەنێوان ئەو دەوڵەتانەدا دادەمەزرێ کە سروشتی سیستەمی ئابووری و رامیاری و کۆمەلایەتییان چۆنیەکە یان پلەو پایەی گەشەسەندنی ئابوورییان لێك نزیکە.

یەکەم- یەکێتی ئەوروپا: European Union

ئەوروپا بەهۆی جەنگی جیهانی دووەم دووچاری کاولکارییەکی فراوان بوو، لە بارێکی نالەبار دەژیا و باری ئابووری شەڕ وێرانی کردبوو و دوو بەرە لێکی جیاکردبوونەوە (ڕۆژهەلات لە ژێر چەتری یەکێتی سۆڤێت و ڕۆژئاوایی

له ژێر چەتری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا). لە هەمانکات دانانی بەربەست لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە نێوان وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا لە
پاڵ دەست تێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووری، ئەمەش وایکرد، کە قەبارەی بازرگانی دەرەکیان سنووردار بێ. لەسەر ئەورووپا پێویست بوو ڕێگە چارەیەك بدۆزێتەوە، بۆ ڕزگارکردنی لەم بارودۆخە، ئەم چارەسەرییە خۆی لە تەولوکاری ئابووری نێوان وڵاتانی ئەورووپا دەنواند.

تەولوکاری ئابووری ئەورووپا لە ماوەی رابردوودا پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوە بینی، زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا هاوبەشییان لە چەندین گەلەکۆمەکی ئابووری کرد، بۆ نموونە کۆمەڵەی ئەورووپی(EEC) کە سەرەتا تەنها شەش وڵات ئەندام بوون تێیدا، کەچی ئێستا (٢٥) وڵات ئەندامن تێیدا وهەمووشیان وڵاتی ئەورووپین.

وەك ئاماژەی پێدرا وڵاتانی ئەورووپا چەندین گەلەکۆمەکیان دامەزراند، تاوەکو گەیشتنە بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا، لەو گەلە کۆمەکانەش:

١- یەکێتی گومرکی کە ناونرا بە (بەنەلۆکس): Benelux کە لە ساڵی ١٩٤٨ دامەزراوە ولەم وڵاتانەپێکهاتووە: بەلجیکا،لۆکسمبۆرگ، هۆلەندا، فەرەنسا وئەلەمانیای ڕۆژ ئاوا وئیتالیا .

٢- کۆمەڵەی خەڵوز وپۆڵای ئەورووپی: ( European Coal and Steel Community ( ECSC ) کە پەیوەندارە بەهەماهەنگی و بەرهەمهێنان و دابەشکردن وهەموو ئەو کارانەی کە بەو دوو پیشەسازییەوە بەستراوە و هەر لەو شەش وڵاتەی لە خاڵی یەکەم ناویان هاتووە پێکهاتبوو.

ئەم وڵاتانە لە پاریس لە ساڵی ١٩٥١ ئەم ڕێکەوتنەی سەرەوەیان مۆر کرد و هەمان شەش وڵاتی ئاماژە پێکرلو پەیوەندییەکانی نێوان خۆیان

گەشەپێدا و دوو پەیماننامەیان لە ساڵی ١٩٥٧ دا لە شاری ڕۆما مۆر کرد، کە ئەمانەن:

١- پەیماننامەی یەکەم پەیوەندار بوو بە دامەزراندنی کۆمەڵەی ئابووری ئەوروپا"European Economic Community " EEC کە دەناسرێت بە (بازاڕی هاوبەشی ئەوروپی) ( " European Common Market " ECM).

٢- پەیماننامەی دووەم پەیوەنداربوو بە دامەزراندنی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی ئەوروپی ( ئیۆراتۆم EURATOM ) بۆ لێکۆڵینەوەی هاوبەش و هاوکاری و بەڕێوەبردن لە بواری وزەی ئەتۆمیدا .

هەر دوو پەیماننامە کە لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨ کەوتنە بواری کارپێکردن گرنگترین بڕگەکانی پەیماننامەی ڕۆما کە پەیوەندار بوون بە دامەزراندنی کۆمەڵەی ئەوروپا ئەمانەبوون :

١-نەهێشتنی ڕەسمی گومرکی و سیستەمی بەشکاری لە نێوان وڵاتانی ئەندام.

٢-یەکخستنی ئەو ڕەسمە گومرگەی کە وڵاتانی ئەندام بەرامبەر جیهانی دەرەکی دەیسەپێنن ودانانی ڕامیارییەکی یەکگرتوو لە بواری بازرگانی دەرەکی.

٣- دانانی ڕامیارییەکی هاوبەش لە بوارەکانی کشتوکاڵ و گواستنەوەدا.

٤- هەڵگرتنی بەربەستەکانی بەردەم گواستنەوەی شمەك و کارگوزاری کار وسەرمایە لە نێوان وڵاتانی ئەندام .

٥-جێبەجێکردنی ئەو ڕێوشوێنانەی دەبنە هۆی هەماهەنگی ڕامیارییەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی ئەم دەوڵەتانە.

ڕێکەوتن لەسەر دامەزراندنی بازاڕی هاوبەش ئەوروپا بەسێ قۆناغ و یەك دوای یەك، هەر قۆناغێك چوار ساڵ دەخایێنێت. قۆناغی یەکەم لە ساڵی ١٩٥٨ دەست پێدەکات، ودوا قۆناغیش لەساڵی ١٩٧٠ کۆتایی دێت، ئەگەر

دامەزراندنی بازاڕ لە ساڵی ١٩٧٠ تەولو نەبوایە دەتوانرا بۆ ماوەی سێ ساڵ ماوەکە درێژ بکرێتەوە ولە ساڵی ١٩٧٢ بە کۆتایی پێ بێت.

ڕێکەوتنی خەڵوز وپۆلا کە لە پاریس ساڵی ١٩٥١مۆرکرا، وهەروەها ڕێکەوتنی رۆمای ساڵی ١٩٥٧، بە بەردی بناغەی کۆمەڵەی ئەورووپا دادەنرێن، لە ساڵی ١٩٦٧ هەردوو کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپا، لەگەڵ کۆمەڵەی خەڵوز وپۆلای ئەورووپی وئیوارتۆم، یەکیان گرت وبەناوی کۆمەڵەی ئەورووپا، ولەساڵی ١٩٦٨ هەڵسان بە دانانی یەکێتییەکی گومرگی، لە نێوان ئەندامەکانی بە گوێرەی ئەوە:

١- یەکجۆر رەسمی گومرگ لەسەر هاوردەنی دەرەکی دادەنرێ.

٢- لابردنی هەموو جۆرەکانی باج.

٣- لابردنی هەموو بەربەستێك لە ڕێگەی بازرگانی نێوان ولاتە ئەندامەکان.

٤- هەڵگرتنی هەموو کۆسپێك لە سەر هاتوچۆی کارو سەرمایە.

٥- دانانی رامیارییەکی هاوبەش لە بوارەکانی کشتوکاڵ و گواستنەوە.

ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەی ئەورووپا زیادبوو لە (٦ ) ولاتی ئەندام لە ساڵی ١٩٥٧ بۆ ( ١٥ ) ولاتی ئەندام لە ساڵی ١٩٩٥، لە ساڵی ١٩٧٣ هەریەك لە ولاتانی: ( دانیمارك ، ئێرلەندە ، بەریتانیا ) بوون بە ئەندام و یۆنان لە ساڵی ١٩٨١، و پورتۆگال و ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٨٦، و نەمسا وفنلندە و سوید لە ساڵی ١٩٩٥. و لە ساڵی ٢٠٠٤ ( ١٠ ) ولاتی تر بوون بە ئەندام تا وەکو ژمارەی ئەندامانی ساڵی ٢٠١١ گەیشتە (٢٧) ولات، ئەم کۆمەڵەیە لە تشرینی دووەمی ١٩٩٣ وە بە (یەکێتی ئەورووپا) دەناسرێت.

بۆ گەیشتن بە ئامانجە سەرەکی و گشتییەکانی خۆیان و بەدەستهێنانی یەکگرتنی رامیاری بە هێز، یەکێتی ئەورووپا هەڵسا بە

دروستکردنی چەند دامەزراوێك كە دەسەڵاتیان لە دەرەوەی سنووری نەتەوایەتی وڵاتە ئەندامەكانیەتی، كە ئەمانەن:

١-كۆمیسیونی ئەورووپی European Commission.

٢-ئەنجومەنی وەزیران Council Of Ministers.

٣-پەرلەمانی ئەورووپی European Parliament.

٤-دادگای دادی ئەورووپی European Court Of Justice.

٥-ئەنجومەنی ئەورووپی European Council.

برگە سەرەكییەكانی پرۆژەی بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا بۆ ساڵی ١٩٩٢ لەمانە پێكهاتووە:

١-دانانی پلانێكی كاركردن، كە بە بەڵگەنامەی (پەرتووكی سپی) ناونرا ولە حوزیرانی ساڵی ١٩٨٥ دا دەرچووە. كە ئامانجی تەواوكردنی بازاڕێكی هاوبەشی ئەورووپی یەكگرتوو بوو.

٢-هەمواركردنی پەیماننامەی ڕۆما لەسەر بنەمای ئەو بەڵگەنامە هاوبەشەی ئەورووپییەی كە دەرچوو بوو.

٣- بەربەستی گومركی و ناگومرگی نوێ لەبەرامبەر وڵاتە ئەندامەكاندا بەرامبەر یەكتری نەسەپێنرێ و لابردنی كۆمەڵێ بەربەست كە دانراون.

٤- بەربەستی نوێ بەسەر بازرگانی نەبینراوی نێوان وڵاتە ئەندامەكانی یەكێتی ئەورووپا دانەنرێ ، بە تایبەتی لە بواری چالاكی بانكەكان، وكۆمپانیاكانی دڵنیایی، و گەشتو گوزار و گەیاندن.

٥- ڕێككەوتن لەسەر مەرجەكانی ئەندامبوون لە یەكێتی ئەورووپا لە داهاتوودا، ئەمەش لەمیانەی ئەو داواكارییەی كە لە لایەن چەند وڵاتێكەوە دلوا كراون بۆ ئەوەی ببنە ئەندام.

٦- گۆڕینی سیستەمی یاساکانی بەڕێوەبردنی بانکەکان ودڵنیایی و گەیاندن و پێوەرەکان و کۆچکردن بە سیستەمێکی یاسایی هاوبەش کە لەم بوارانەدا جێبەجێبکرێ و لەهەموو وڵاتانی ئەندام، ئەمەش لە ڕێگەی دادگای دادی ئەورووپییەوە دەبێت.

٧- کردنەوەی سنووری نێوان یەکتر بۆ ئازادی گواستنەوەو هاتوچۆی تاکەکان وشمەك وکارگوزاری وسەرمایە لە نێوان دەوڵەتە ئەندامەکان.

٨- دیاریکردنی هەڵوێستێکی یەکگرتووی وڵاتە ئەندامەکان بەرامبەر زۆر لە پرسەکان وەك (ڕامیاری کشتوکاڵ و بازرگانی کارگوزارییەکان لە ڕێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی).

**پەیماننامەی ماستریخت:**

پەیماننامەی ماستریخت کە سەرکردەی وڵاتانی یەکێتی ئەورووپا لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩١ لەسەری ڕێککەوتوون بەگرنگترین لادان دادەنرێ کە ڕێڕەوی یەکێتی ئەورووپی لەساڵی ١٩٩٢وە و تاوەکو ئێستا و داهاتووش دەست نیشان دەکات پێوەر و هەنگاوی ئاشکراو دیاریکراو و قۆناغی ڕاستەقینەی دانانی تەواوکاری نەختیینەیی خۆی لە دەرکردنی دراوێکی نوی بە ناوی (**یۆرو** Euro) دەبێتەوە.

**دووەم-هاوبەندی دەوڵەتەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا(ئاسیان):**

ئاسیان لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکارو بارودۆخ کە وڵاتە ئەندامەکانی ئێستای هاندا بۆ دامەراندنی پێك هات، لە ساڵی ١٩٦٧ لە بانکۆك (تایلاند) کۆبوونەوەیەك لەنێوان وڵاتە ئەندامەکان بەسترا لە سەر ئاستی وەزیرانی دەرەوە وبڕیارنامەیەکیان دەرکرد کە بە(**بڕیارنامەی بانکۆك**) ناسرا،

بەخاڵێکی وەچەرخانی گەورە دادەنرێ لە پەیوەندییەکانی هاوکاری هەرێمایەتیدا. ئەم هاوبەندییە پێکهاتووە لە وڵاتانی (برونای و ئەندەنووسیا و مالیزیا و فلبین و سەنگافورا و تایلاند)، هەرچەندە ئەم هاوبەندییە پێکهاتەیەکی رامیاریە کەچی لە ساڵی ١٩٧٧ بڕیاری دامەزراندنی بازارێکی هاوبەشی فراوان و گەورە کە دەتوانرێت بەشێوەیەکی باش و بازرگانی بکاتە ئامرازێکی چالاك بۆ هاندانی گەشەپێدانی ئابووری .

## ئامانج و مەبەستەکانی رێکخراوی ئاسیان:

بڕیارنامەی دامەزراندنی ئاسیان ئامانجەکانی رێکخراوی بەم خاڵانە دیاری کردووە :

١. زیادکردن و پاڵپشتیکردنی پەرەسەندن ئابووری و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و بوژاندنەوەی رۆشنبیری.
٢. هەوڵدانی هاوبەش لەسەر بنەمای گیانی یەکسانی و گەیاندنی بە گەلانی ناوچەکە بە کۆمەڵگەیەك کە بوژانەوەو ئاشتی تێدا بەرقەرار بێت.
٣. کارکردن لەپێناو دابینکردنی ئاشتی و چەسپاندنی سەقامگیری لە ناوچەکەدا، ئەویش لەرێگەی پابەندبوون بەو یاسا نێودەوڵەتیانەی هەیەو کە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان دیاری دەکات و پابەند بوون بە رێساو بنەماکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.
٤. هەماهەنگی و هاوکاری لەو بابەتانەی کە گرنگیەکی هاوبەشیان هەیە لە لایەنی ئابووری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و زانستی و کارگێڕییەوە.

٥. گرنگیدان بە هاوکاری ئاڵوگۆڕکردن لەبوارەکانی مەشقکردن و لێکۆڵینەوەو فێرکردن و پسپۆڕییە هونەرییەکان و رێکخستن و هەماهەنگی لە پێناوی بەدەستهێنانی دەستکەوتی باشتر لە بوارەکانی کشتوکاڵی و پیشەسازی و فراوانکردنی ئاڵوگۆڕی بازرگانی.

٦. جەختکردن لەسەر بەکارنەهێنانی بنکە سەربازییەکانی بیانی کە بەشێوەیەکی کاتی لە وڵاتانی ناوچەکە هەن بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە دژی هیچ دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکانی هاوبەندییەکە بەکار نەهێندرێت کە کار لە سەربەخۆیەتی و سەروەری دەوڵەتەکە بکات یان کاریگەری لەسەر پەرەسەندنی نیشتمانی هەبێ.

دوارۆژی ئاسیان:

بۆ ئەوەی ئاسیان ئەو ئامانجانە بەدی بێنێ کە لە پێناویدا دامەزراوە، پرۆگرامێکی دلناوە پێی دەگوترێ (تێڕوانینی ئاسیان لە ساڵی ٢٠٢٠ ) کە لەم خاڵانەی خوارەوە پێکهاتووەو لەسەر ئاسیان پێویستە جێبەجێی بکات تا بتوانێ ئامانجەکانی بەدەست بێنێ:

١- پارێزگاریکردنی سەقامگیری دارایی و سەقامگیری لە ئابووری هەمووەکی لەرێگەی هاندانی رلوێژکاری نزیك لەبواری رامیاری دارایی و رامیاری ئابووری هەمووەکی .

٢- بۆ بەرەوپێش بردنی تەولوکاری ئابووری و هەماهەنگی لە میانەی گرتنەبەری ئەم ستراتیژییە گشتیانەی گشتی خوارەوە :- جێبەجی کردنی

تەولو لە ناوچەی بازرگانی ئازادی ئاسیان و پەلەکردن لە ئازادکردنی بازرگانی خزمەتگوزاری، و پێکهێنانی ناوچەکی وەبەرهێنانی. ئاسیان لە ساڵی ۲۰۱۰ و ئازادی گواستنەوەی هاتنە ناوەوەی وەبەرهێنان لە ساڵی ۲۰۲۰ زیاترکردن و فراوانکردنی هەماهەنگی لەگەڵ رێکخراوە هەرێمییەکانی تر کە هەن یان تازە پەیدابوون.

٣- هاندانی کەرتەکانی پرۆژەی بچوك و ناوەندی نوێ و کێبڕکی لەگەڵ ئاسیان کە بەشداری دەکات لە بوژانەوەی پیشەسازی و لێهاتوو لە ناوچەکەدا.

٤- پەلەکردن لە هاتنە ناوەوەی ئازادی پسپۆڕیەکان و خزمەتگوزاری تر لەناوچەکەدا.

٥- هاندانی ئازادکردنی کەرتی دارایی و هەماهەنگی بەهێز لە بازاڕی درلو و دارایی دا، و باج و دڵنیایی و بابەتی گومرگی، سەرباری راوێژ کردنی بەهێز لە ڕامیاری دارایی و ڕامیاری ئابووری هەموەکی.

٦- پەلەکردن لە پێشخستنی زانستی و تەکنەلۆژی و لەوانەش تەکنەلوجیای زانیاری لە رێگەی دامەزراندنی تۆڕی زانیاری تەکنەلۆژیی هەرێمی و بنکەی پێشکەوتوو بۆ ئاسانی بڵاوکردنەوە و گەیشتن بە داتا و زانیارییەکان.

٧- پێکهێنانی رێکخستنی پەیوەندار بە کەرتی وزە و کەرتی کارەبا و گازی سروشتی و ئاو لە چوارچێوەی ئاسیان لە رێگەی تۆڕی وزەی ئاسیان و بۆرییەکانی گواستنەوەی گاز و بۆری گواستنەوەی ئاو لە ئاسیاندا، هاندانی هەماهەنگی لەبواری وزەی بەدەست هاتوو، شان بە شانی پێشکەوتنی سەرچاوەی وزەی نوێ و تازە پەیدابوو.

٨- دابینکردنی ئاسایشی خۆراك و کێبڕکێی نێو دەوڵەتی لەسەر خۆراك و کشتوکاڵ و بەڕێوەبردنی دارستان و گفتوگۆو بوژاندنەوەی بەردەوام.

٩- دابینکردنی خواستی زیادبوو (گەشەکردوو) لەسەر ژێرخان و گەیاندنی پێشکەوتوو لە رێگەی پێشخستنی تۆڕی رێگەی پێشکەوتوو تەواوکار لەچوارچێوەی ئاسیان ورێگە خۆشکردن لەبەردەم پیشکەوتنی تەکنۆلۆژیا لەبواری گەیاندن و تەکنەلۆژیای زانیاری و هاندانی رامیاری ئاسمانی کراوەو پێشخستنی گواستنەوەی فرە رێگاکان و ئاسانکاری تێپەڕینی کالای تەولوکەر لە تۆری گەیاندنی بێ تەلدا.

١٠- چاکردن و گەشەپێدانی دەرامەتی مرۆیی لە هەموو کەرتە ئابوورییەکان لە رێگەی چاککردنی فێرکردن و بەرزکردنەوەی شارەزایی و تواناکان و مەشقپێکردنیان.

هەندی ئەزموونی تەواوکاری ئابووری دیکە لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکان:

ئەو سەرکەوتنەی ئەوروپا لە ئەزموونی خۆیان کاریگەری تەولویان هەبوو لە هاندانی ولاتە دواکەوتووەکان، بۆ ئەوەی چەندین گەلەکۆمەکی جۆربەجۆر لەبوارە جیاوازەکان ببەستن وەکو رێگایەك بۆ هاندانی بوژانەوەی ئابووری، ئەمەش گەر لە کیشوەری ئاسیا یان ئەفریقیا یان ئەمەریکای لاتینی بێ و بەکورتی باسی بەشێك لەو گەلە کۆمەکیانە دەکەین جا سەرکەوتوو بووبن یاخود پاشەکشەیان کردبێ لەوانە:

یەکەم-رێکخراوی بازرگانی ئازاد لە ولاتانی ئەمەریکای لاتینی (لافتا):

ئەم رێکخراوە لەلایەن مەکسیك و کۆمەلێك لە ولاتانی ئەمەریکای لاتینیەوە دامەزرا، هەروەها ئەم رێکخراوە کۆمەلێ لقی لێ پەیدا بووە، کە هاوپەیمانی (ئاندین) یەکێکە لەوانەی کە لە سالی ١٩٦٩ کە لە هەریەکە لە بۆلیفیا ئەکوادۆر و تشیلی کۆلۆمبیاو پیرۆ دامەزراوە، وا پێشبینی لەم هاوپەیمانە دەکرێ کە پەلە لە تەولوکاری ئابووری کرلو بازارێکی هاوبەشی

دامـەزرێنیّ، کەچـی رێکخـراوی تـەولوکاری ئـابووری ئەمـەریکای لاتـینی (لایـا) هەڵوەشایەوەو لە جێگە هاوپەیمانیەتی (ئاندین) لەساڵی ١٩٨٠دا.

دووەم — بازاڕی هاوبەشی قوچەکی (مخروط) باشوور:

ئەم بازاڕە لەلایەن ئەرجنتین و بـەرازیل و پـاراگوای وئۆرگـوای لـە سـاڵی ١٩٩١ دامەزرا و لەساڵی ١٩٩٥ بۆتە یەکێتیەکی گومرگی لە ساڵی ١٩٩٦ بۆلیڤیا و شیلی بوونە ئەندام تێیدا.

سێیەم — کۆمەڵەی ئابووری ولاَتانی رۆژئاوای ئەفریقیا:

ئـەم کۆمەڵەیـە لـە (مـایو) لـە سـاڵی (١٩٧٥) دامـەزرا، کـە ١٨ دەوڵـەتی ئەفریقی لە خـۆ دەگریّ، ئـەو کۆمەڵەیـە بـۆ دەسـتەبەرکردنی کۆمـەڵێك ئامـانج هەولّ دەدات لەوانە بۆ دەستەبەرکردنی ئازادی گواستنەوە و سـەرمایەو سـامان و شمەك و خزمەتگوزاری لە نێوان دەوڵەتە ئەندامـەکان، هەماهـەنگی لـە نێـوان ولاَتەکان لە بواری ڕامیاری کشتوکاڵی و ئەو پرۆژانەی داهاتی هاوبەشیان هەیـە، هەروەها لەبواری لێکۆڵینـەوەی کشـتوکاڵی و دەرلمەتـە ئاوییـەکان و هۆیـەکانی گواستنەوەو وزە، نەیتوانی ئەم ئامانجانە بەدی بێنیّ تەنها چـەند شـتێکی کـەم نەبێت.

چوارەم — رێکخراوی الایجاد:

بریتییـە لـە دەسـتەی مـیری بـۆ پەرەپێـدانی بیابـان و لـە سـاڵی ١٩٨٦ دامـەزرا، دواتـر لەسـاڵی ١٩٩٥گـۆڕا بـۆ دەسـتەی مـیری بـۆ پەرەپێدان و ئـەم دەوڵەتانـە لـەخۆ دەگـریّ (جیبـۆتی، وئـەریتریا، ئەسـیوپیا، کینیـا ، ئۆگەنـدا، سۆمالّ، سـودان، تـەنزانیا، روانـدا، بۆرونـدی) بـە شـێوەیەکی گشـتی ئامـانجی پەرەپێدانی ئابووری دەوڵەتە ئەندامەکانە.

-کۆسـپەکانی سـەرنەکەوتنی گەلەکۆمـەکی ئـابووری لـە ولاَتـانی تازەپێگەیشتوودا:

١- سوودەکانی دەستکەوتووی تەواوکاری ئابووری بەشێوەیەکی یەکسان لەنێوان وڵاتانی ئەندام دابەش ناکرێ، چونکە ئەو وڵاتانەی کە زیاتر پێشکەوتوون ئەوان زۆربەی سوودەکان وەردەگرن، بۆیە وڵاتانی دواکەوتووتر هەوڵ دەدەن لەم گەلە کۆمەکییە بکشێنەوە بەمەش هەوڵی تەواوکاری ئابووری هەرەس دێنێ.

٢- زۆربەی وڵاتانی دواکەوتوو حەز ناکەن واز لەبەشێك لەو سەروەریە بێنن کە بە دەستیان هێناوە و بیدەن بە دەسەڵاتی گەلەکۆمەکیەکەی کە دەسەڵاتەکەی هەموو سنوورێکی نەتەوەیی دەوڵەتە ئەندامەکان دەبڕێ، هەروەك تەواوکاری ئابووری سەرکەوتوو وا دەخوازێ .

٣- کەموکورتی لە رێگاکانی گواستنەوەو گەیاندنی نوێ و باش لە نێوان وڵاتە ئەندامەکان.

٤- کێبڕکێکردن لەسەر هەمان بازاڕی جیهانی بۆ ناردنی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بۆ وڵاتە ئەندامەکان.

٥- دووری لەماوەی نێوان دەوڵەتە ئەندامەکان.

## پرسیارەکانی بەشی شەشەم

١. ئامانجی سندوقی نێو دەوڵەتی چیە؟
٢. ئەو ڕێوشوێنانە چین کە لەلایەن سندوقی نێو دەوڵـەتی دەگرێتـە بـەر بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانی ؟
٣. پێناسەی بەش بکە ؟ ئەو مەرجانە چین بۆ دیاریکردنی بەشی دەوڵـەت لـە سـندوقی دراوی نێودەوڵەتی؟ چۆن بەشی دەوڵەتی ئەندام دیاری دەکری ؟
٤. کارگێری سندوقی نێودەوڵەتی لەچی پێك دێت؟
٥. ئامانجی بەنکی نێودەوڵەتی چیە ؟ وە ئەو ڕێگایانە چین کە دەیگرێتەبەر ؟
٦. ئەو ڕێگایانە چین کە بانك دەیگرێتەبەر بۆ قەرز پێدان؟
٧. کارەکانی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی چیە ؟
٨. چۆن دەزگای ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی کاردەکات ؟
٩. پەیکەری ڕێکخستنی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی چیە ؟
١٠. ڕۆڵی داهاتووی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی چییە؟
١١. مەبەسـت لـە دامەزرانـدنی ڕێکخـراوی دەوڵەتـە نـەوت فرۆشـەکان چییە؟ رامیاریـان چییە؟ ئامانجی ئۆپێك چیە؟
١٢. خاڵە ناکۆکەکانی نێوان وڵاتانی ئۆپێك چییە؟
١٣. برگەکانی پەیماننامەی ڕۆما (یەکێتی ئەورووپا) چییە؟
١٤. یەکێتی ئەورووپا لە زۆر دامەزراوە پێکهاتووە چین ؟
١٥. ئامانجی یەکێتی ئەورووپا چیە ؟
١٦. پرۆژەی بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا لەساڵی ١٩٩٢ لە چ پێك دێت ؟
١٧. ڕێکەوتنی ماستربیخت گەیشتە کوێ ؟
١٨. ئامانجی ڕێکخراوی ئاسیان چیە ؟
١٩. پێویستە ڕێکخراوی ئاسیان چی بکات تا بەدەوری خۆی هەڵبستێ ؟
٢٠. هەندێ لە ئەزموونەکانی تەواوکاری ئابووری لە وڵاتە دواکەوتووەکان بژمێرە.
٢١. کۆسپەکانی بەردەم سەرکەوتنی گەلەکۆمەکی ئابووری لە وڵاتە دواکەوتووەکان چـین ؟

## سەرچاوەکانی بەشی شەشەم


١. د . عبدالله الطاهر و د . موفق علي الخليل، النقود والبنوك والمؤسسات المالية ، الطبعة الاولى، مركز يزيد للنشر، الكرك ، ٢٠٠٤ .

٢. د . محمود يونس ، اقتصاديات دولية ، الدار الجامعية ، الاسكندرية ، ٢٠٠٧ .

٣. علي عبدالفتاح شرار ، الاقتصاد الدولي : نظريات و سياسات ، الطبعة الاولى ، دار المسيرة للنشر والتوزيع والاعلان ، عمان ، ٢٠٠٧ .

٤. ماخوذ من الانترنيت : الموقع : www.study4uae.com/vb/showthread.php?t=3988

٥. ماخوذ من الانترنيت : الموقع : http://ar.wikipedia.org/w/index.php?title

٦. ماخوذ من الانترنيت : الموقع:

٧. د. مصطفى السفاريني : ماخوذ من الانترنيت : الموقع: www.arabsino.com

٨. ماخوذ من الانترنيت : الموقع: Terms Of Reference And Guidelines For The Organization Of Asean Committees In Third Countries .

٩. www.asean.org

١٠. ماخوذمن الانترنيت: الموقع: Asean Secretariat، Asean Vision 2020. www.asean.org

# لیستی زاراوەکان

| ئینگلیزی | عەرەبی | کوردی |
| --- | --- | --- |
| Economics | علم الاقتصاد | زانستی ئابووری |
| Public Finance | المالية العامة | دارایی گشتی |
| Political Sciences | العلوم السياسية | زانستە رامیارییەکان |
| The Science Of Law | علم القانون | زانستی یاسا |
| Statistics | علم الاحصاء | زانستی ئامار |
| Function | الوظيفة | ئەرك ( پۆست ) |
| Allocation Function | وظيفة التخصيص | ئەرکی تەرخانکردن |
| Social Welfare | رفاهية المجتمع | خۆشگوزرانی کۆمەڵگە |
| Optimum Function | التخصيص الامثل | تەرخانکردنی نمونەیی |
| Maximum Social Gain | اقصى كسب للمجتمع | بـــەرزترین دەســـــکەوت بۆکۆمەڵگە |
| Social Costs | التكاليف الاجتماعية | تێچوونە کۆمەڵایەتییەکان |
| Social Benefits | المنافع الاجتماعية | کەڵکە کۆمەڵایەتییەکان |
| Net Social Gains | صافي مكاسب المجتمع | دەسکەوتە کۆمەڵایەتیەکان |
| Distribution Function | وظيفة التوزيع | ئەرکی دابەشکردن |
| Redistribution | اعادة التوزيع | دووبارە دابەشکردن |
| Stabilization Function | وظيفة الاستقرار | ئەرکی سەقامگیری |
| Stagflation | التضخم الركودي | هەڵاوسانی دلکێشاوی |
| Growth Function | وظيفة النمو | ئەرکی گەشەکردن |
| Economic Growth | النمو الاقتصادي | گەشەی ئابووری |
| Growth Of Economic Resources | نمو الموارد الاقتصادية | گەشـــــەکردنی ســــــامانە ئابوورییەکان |
| Technical Change ( Progrss ) | التغير ( التقدم ) التكنولوجي | گۆڕانکـــاری (پێشـــکەوتن) تەکنەلۆژی |
| Public Wants | الحاجات العامة | پێداویستی گشتی |
| Private Wants | الحاجات الخاصة | پێداویستی تایبەت |
| Private Goods | السلع الخاصة | شمەکی تایبەت |

| ئینگلیزی | عەرەبی | کوردی |
|---|---|---|
| Public Goods | السلع العامة | شمەکی گشتی |
| Market Failure | فشل السوق | هەرەسهێنانی بازاڕ |
| Rival Consumption Principle | مبدا التنافس في الاستهلاك | بنەمای کێبڕکێ لە بەکارهێنان |
| Exclusion Principle | مبدا الاستبعاد | بنەمای لا بردن |
| Public Expenditure | النفقات العامة | خەرجیە گشتییەکان |
| Multiplier | المضاعف | لووهەندە |
| Accelerator | المعجل | بەپەلە |
| Public Revenues | الايرادات العامة | دەسهاتی گشتی |
| The Domin Revenues | دخل املاك الدولة | داهاتی موڵکانەی دەوڵەت |
| Portfolio | المحفظة المالية | جانتا |
| Taxation،Taxes | الضرائب | باج ، باجەکان |
| Financial Contract | العقد المالي | گرێبەستەی دارایی |
| Taxpayer | المكلف (دافع الضريبة) | باجدەر |
| Direct Taxes | الضرائب المباشرة | باجی ڕاستەوخۆ |
| Indirect Taxes | الضرائب غير المباشرة | باجی نا ڕاستەوخۆ |
| Flat Tax Rate | سعر الضريبة النسبي (الخط المستقيم) | نرخی ڕێژەیی باج (هێڵی ڕاست ) |
| Tax Aoidance | التجنب الضريبي | خۆ لادان لە باج |
| Tax Evasion | التهرب الضريبي | ڕاکردن لە باج |
| Duties | الرسوم | رەسم |
| Public Loans(Borrowing) | القروض العامة | قەرزی گشتی |
| Disposable Income | الدخل التصرفي (الدخل القابل للتصرف) | داهاتی خولاو (داهاتی ئامادە بۆ خەرج) |
| Deflationary Effects | الاثار الانكماشية | ئاسەواری داکێشراو |
| Progressive Taxes | الضرائب التصاعدية | باجی هەڵکشاو |
| Infant Industreis | الصناعات الوليدة او الناشئة | پیشەسازی تازە دامەزراو |
| Inflationary Effects | الاثار التضخمية | ئاسەواری هەڵاسانەوە |
| Public Budget | الموازنة العامة | بودجەی گشتی |

# پێرست


| ل | بابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|
| | بەشی یەکەم– داهاتی نەتەوەیی | ٤ |
| | بەشی دووەم–بازرگانی | ٤٢ |
| | بەشی سێیەم – ڕامیارییە ئابوورییەکان | ٨٤ |
| | بەشی چوارەم_ دواکەوتن و پەرەپێدان پلاندانان | ٩٤ |
| | بەشی پێنجەم–دارایی گشتی | ١٢٩ |
| | بەشی شەشەم –ڕێکخراوە ئابوورییەکان | ١٧٩ |